

له شەڕەفخانی بتلیسی سەدەی ١٦
تا میرزا عەلی ئەکبەری کوردستانی
سەدەی ١٩ی زایینی

# هۆزەکانی کورد

## لەروانگەی مێژوونووسانی کورد

یەڤگێنیا ئیلی‌نیچنا ڤاسیلی‌یەڤا

وەرگێڕانی: مەنسوور سدقی

٢٠١٦

# هۆزەکانی کورد

## لەروانگەی مێژوونووسانی کورد

**لە شەڕەفخانی بتلیسی سەدەی ١٦**
**تا میرزا عەلی ئەکبەری کوردستانی**
**سەدەی ١٩ی زایینی**

**یەڤگێنیا ئیلی‌نیچنا ڤاسیلیەڤا**
**وەرگێرانی: مەنسوور سدقی**

**٢٠١٦**

# پێڕست

## پێشەکی وەرگێڕ

ی. ئی. ڤاسیلی‌یەڤا ئەو لێکۆڵینەوەی لەساڵی ٢٠٠٣دا نووسیوە و ئەو کاتی لە چەند ماڵپەرێکی رووسی بڵاوکراوەتەوە. لە ساڵی ٢٠١٠ بە هێندێک گۆڕانکاریی، لە گۆڤاری "بەڵگەنامە مێژووییەکانی رۆژهەڵات"[١]، ژمارە ١ (١٢)، لاپەڕەکانی ٢٠٧ تا ٢٣٠، لەچاپ دراوە. سەرچاوەی ئەو وەرگێرانە، دەقی ئەو گۆڤاریە.

خانمە مێژوونووس و کوردناسی بەناوبانگ، ی. ئی. ڤاسیلی‌یەڤا، تەاوی ژیانی خۆی بۆ بەدوواداچوون، لێکۆڵینەوە، ئاشکرا کردن و تەنانەت گەڕان و دۆزینەوەی سەرچاوە کۆن و تازەکانی مێژووی کورد و

---

[١] ئەو گۆڤارە بەرهەمی "پەیمانگای دەستنووسە رۆژهەڵاتییەکان" لە سان پێترزبورگ، سەر بە ئاکادێمیای زانستەکانی رووسیایە کە ساڵانە ٢ ژمارەی لێ چاپ و بڵاو دەکرێتەوە. لە ساڵی ٢٠٠٤ەوە تا ساڵی ٢٠١٥، ٢٢ ژمارەی بڵاوکراوەتەوە.

http://www.orientalstudies.ru/rus/index.php?option=content&task=view&id=51

کوردستان لە ئاڕشیڤخانە و پەڕتووکخانەکاندا بردۆتەسەر[1].

ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، ئەو نووسراوەی تەرخان کردووە بە هۆزەکانی کورد و وەک بۆخۆی باسی دەکا، "تەنیا لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا، نەخشی مێژوویی هۆزی کورد لە لێکۆڵینەوە کوردناسییەکاندا سرنج و بایەخی ڕاستەقینەی بۆلای خۆی راکێشاوە. پێشتر، زۆربەی هەڵسەنگاندنەکان بەتەواویی نەرێنی بوون". پاشان باسی ستروکتورە کۆمەڵایەتی- سیاسییەکانی پێکهاتنی کۆمەڵگای کورد دەکات و ئاماژە بە زۆر لایەنی سرنجڕاکێشی ئەو ستروکتورە دەکات کە بێگۆمان بۆ ناسین و لێکدانەوەی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و بەگشتی تەوای کۆمەڵگای هەنووکویی کورد لە هەر چوارپارچەی کوردستان زۆر گرینگە.

هەستی مرۆڤدۆستانە و کورد دۆستانەی ی. ئی. ڤاسیلیەڤا سەبارەت بە چارەنووسی مێژوویی نەتەوەی کورد کە لە قوڵایی لێکۆڵینەوە زانستی و بێلایەنەکانی ئەو خانمە کوردناسە مەزنە سەرچاوەی گرتووە، لە وشە بە وشەی نووسراوەکانیدا و بەرەبەرە لەو ماوە دور و درێژەی ژیانی زانستیانە لەپێناو مێژووی کورد و کوردستاندا، هەڵکشانی بەخۆیەوە بینیوە و بەتایبەت لەو نووسراوە کورت و پۆخت و فرە بەنرخەی کە ئێستا لەبەر دەستاندایە بە جوانی خۆی نیشان دەدات.

کاتێک نووسەر لەزمانی مێژوونووسەکانی کورد داخ و بەژارەی خۆی

[1] بڕوانە بەرهەمەکانی لە ل. ٨.

بـۆ یەکنەگرتـوویی و پەرتەوازەیـی سیاسـی لایەنە جیاوازەکـانی کـورد دەردەبـڕێ و کاتێـک باسـی نـاوچەگەریی و خـۆبەزلزانینی هێنـدێک لایەنـی دیکە دەکـات و وەک کێشـەیەکی لەبنەهـاتووی کـورد نـاوی لێـدەبات، بۆچـوونی سـەرەوە دەسـەلمێنێ. ی. ئی. ڤاسـیلی‌یەڤا، تەنانەت لە هەمـوو کـورد دەپـارێتەوە بـۆ دۆزینەوەی سـەرچاوە مێژووییە نادیارەکـان تـا زۆرتریـن زانیـاری لە سەر مێـژووی ونکـراوی کـورد بـۆ سـاخکردنەوی شـکۆ و هێـزی کـورد و سەلماندنی مـافی حاشالێنەکراوی بۆ دامەزرانـدنی کیـانێکی سـەربەخۆ، پێشـانی جیهـان بدرێت.

هیوادارم ئەو بەرهەمە بەنرخە یارمەتیدەری ئەو پسـپۆر و لێکـۆڵەرانە بێت کە خۆیان بە مێژووی گەلەمـان خەریـک کـردووە و تـا دێ ژمارەیـان زۆرتر دەبێ.

**تێبینی:**

هەموو ئەو روونکردنەوانەی کە لە دەقەکە یان لە ژێرنووسـەکان و لە نێو دووکەوانی راستدا [...] هاتووە، لەلایەن وەرگێڕەوە زیادکراوە.



# ی. ئی. ڤاسیلیەڤا و بەرهەمەکانی[1]

یەڤگێنیا ئیلی‌نیچنا ڤاسیلی‌یەڤا، دوکترای زانستە مێژوویەکان، لە ساڵی ١٩٣٥ لە گوندی کێیی‌ڤێتس، سەر بە ناوچەی نۆڤۆگۆرد لەدایکبووە. لە مانگی دیسەمبەری ساڵی ١٩٤٤ وێڕای ماڵباتی لە شاری لێنینگراد نیشتەجێ دەبن. لە ساڵی ١٩٥٣ پاش تەواوکردنی خوێندنی ناوەندی، لە زانکۆی میریی لێنینگراد، لە بەشی ڕۆژهەڵاتناسی وەردەگیرێ. پاش تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ، لە ١٩٥٨.

---

[1] سەرچاوە: ماڵپەڕی پەیمانگای دەستنووسە ڕۆژهەڵاتییەکان، سەربە ئاکادێمیای زانستەکانی ڕووسیا (سان پێترزبورگ)

http://www.orientalstudies.ru/rus/index.php option=com_personalities&Itemid=74&person=50

۸.۱۵وه تـــا ســـاڵی ۲۰۱٦ له پەیمانگـــای ڕۆژهەڵاتناســـی سەر بە ئاکادێمیای زانستەکانی ڕووسیا کاریکردووە. مێژووی کورد و کوردستان لە سەدەی ناوەڕاســـت و سەردەمی نـــوێ، ئاڕاســـتەی سەرەکی لێکۆڵینەوەکـانی پێکـدێنێت. لەسـاڵی ۱۹۷۷ تـوانی بـبێتە کاندیـد بـۆ وەرگرتنـی دوکـترای مێـژوو و لە ۱۹۹۲ لەسەر نووسـینی پەڕتـووکی " باشـووری ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان" نازنـاوی دوکـتری مێـژوی پێـدرا. بەرهەمەکانی بریتین لە:

**۲۰۱۲**

●علی اکبر وقایع‌نگار کردسـتانی، "حـدیقه ناصری"// لە فارسـییەوە، پێشەکی، تێـبینیی و ئاماژەکـان، ی. ئی. ڤاسـیلی‌یەڤا، سـان پێترزبورگ، وەشانخانەی Neostro- Istoriya، ۲۰۱۲، ۳٥٦ لاپەڕە.

**۲۰۱۰**

●ی. ئی. ڤاسـیلی‌یەڤا، جافەکـان نمـوونەیەکی کلاسـیک لە هـۆزی کورد // بەڵگەنـامە یادگارییەکـانی ڕۆژهەڵات، ژمـارە ۱ (۱۲)، ۲۰۱۰. ل. ۹۳-۱۰۲.

●ی. ئی. ڤاسـیلی‌یەڤا، مێژوونووسـانی کـورد و هۆزەکـانی کـورد (لە شەڕەفخان بتلیســـی – سەدەی ۱٦ تـــا میـــرزا عەلـــی ئەکبەری کوردســـتانی- سەدەی ۱۹) // بەڵگەنـــامە یادگارییەکـــانی ڕۆژهەڵات، ژمارە ۲ (۱۳)، ۲۰۱۰. ل.ل. ۲۰۷-۲۳۰. "نووسراوەی ساڵی ۲۰۰۳"

ی.ئ. واسیلی‌یەڤا، شەڕەفخانی بتلیسی. سەردەم. ژیان. نەمریی. بە وردبینیی شاکروو محۆی (E. I. Vasilyeva. Sheref-khan Bidlisi: Epoch, Life, Immortality) سان پێترزبورگ. وەشانخانەی "نائووکا"، ٢٠٠٣. ١٠٤ لاپەڕە ، ISBN 5-02-027098-9

● رەشید سەبری رەشید، (رەشاد میران). هەلومەرجی ئایینزا نەتەوەییەکان لە کوردستانی هاوچەرخدا، بە ئێدیتۆریی ی. ئی. ڤاسیلی‌یەڤا- سان پێترزبورگ، "نائووکا"، ٢٠٠٣، ١٨٤ لاپەڕە. ISBN 5-02-026975-1 (١٩٩٩)

● Vasilyeva E. The First Persian, French and Russian Editions of the “Sharaf-nāma” // Manuscripta Orientalia. Vol. 5, No 1, March 1999. P. 27-31. (1991)

● ی. ئی. ڤاسیلی‌یەڤا، باشووری رۆژهەڵاتی کوردستان لە سەدەی ١٧ تا سەرەتای سەدەی ١٩. لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە میرنشینەکانی ئەردەڵان و بابان، بە ئێدیتۆریی م.س. لازریێف. مۆسکۆ، 'نائووکا'، سەرنووسەری تۆرەی رۆژهەڵات، ١٩٩١ (١٩٩٠)

● ماه شەڕەف خانم کوردستانی. رووداوەکانی خانەدانی ئەردەڵان. لە فارسییەوە، بە پێشەکی و تێبینیی ی. ئی. ڤاسیلی‌یەڤا، بە ئێدیتۆریی ئۆ. ف. ئاکیموشکین، مۆسکۆ، نائووکا، سەرنووسەری

تۆرەی رۆژهەڵات، ١٩٩٠

**١٩٨٤**

- خوسرەو بن محەمەد بەنی ئەردەڵان. رووداوەکانی (مێژووی میرنشینی خانەدانی بەنی ئەردەڵان). لەرووی وێنەی ئەو پەڕتووکە. بڵاوکردنەوە، وەرگێران، پێشەکی و تێبینیی: ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، ئێدیتۆر ل. ت. گئۆزەلیان، مۆسکۆ، نائووکا، سەرنووسەری توورەی رۆژهەڵات، ١٩٨٤.

## سەرەتا

لەو نووسـراوەیەدا بیروبۆچوونەکـانی 6 مێژوونووسـی کـورد پێشـکەش دەکەم کە بەرهەمەکانیـان بە زمـانی فارسـی نووسـیوە. هەریەک لەو نووسـەرانە سـەبارەت بە هـۆزی کـورد بەپێـی پێگەی کۆمەڵایەتییـان و تەنانەت شوێنی نیشتەجێ بوونیان (لە شار یـان لە گونـد)، بۆچـوونی تایبەت بەخۆیان هەبووە.

* * * * * *

هەڵسـەنگاندن و پێـداچوونەوە بە پێگە و گرنگیـی خێـڵ و هـۆز و عەشـیرەتەکان لە چارەنووسـی مێـژووی کـورددا دژوارە. سـتروکتوری عەشیرەتی هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ مێژووی کورد هاوشـان و هـاوڕێ بووە و لەوانەیە بە شێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ کـاردانەوەی لەسـەر گشـت کۆمەڵگـای کـوردی دانەنـابێ. بەڵام ئەو سـتروکتورە کـۆمەڵایەتییە بە تەواویـی کـاردانەوەی لە سەر هـزری کـۆمەڵایەتی کـورد لە هەمـوو بوارەکانی ژیانیدا واتە، لە ژیـانی ئابـووری، لە سـتروکتوری دەسـەڵات،

لە پێکهاتەی هزرە داسەپاوەکاندا داناوە. هەموو قۆناخەکانی رابـردووی خەبـاتی سیاسـی و خەبـات لەپێنـاو دەسـەڵات لە کوردسـتاندا بەشێوەیەکی ناچـاری و لەبنەڕەتەوە لەگەڵ هـزری خێڵایەتیـی تێکەڵاو بـووە. سـەرچاوەی دەسـەڵاتی هەریەک لە بنەمـاڵە و خـانەدانە حوکمڕانەکان دەگەڕیتەوە بۆ هۆزێکی مەزن یان یەکێتیی چەندین هۆز.

هۆزی کورد، ئەو واتا و مانا مێژوویی و پاشکەوتوو و کۆنەپەرەستانە لەخۆ نـاگرێ، کە لە روانگەی بـاودا بەو پێکهـاتە کـۆمەڵایەتییە پێـش لە کۆمەڵگـای چینـایەتییە دەگـوترێ. هـۆزی کـورد، سـتروکتورێکی کـۆمەڵایەتی-سیاسـیی و ئابـووریی زینـدوو، پڕچـالاک و ژیانمەنـدە کە لەسـەر بنەمـای هەسـتی خزمـایەتی و هاوسـۆزیی گشـتگیر بـۆ هـۆز پێکهاتووە. پێوەسـتبوون بە هۆز لە رێگای لەخۆبردوویی ئەندامانی هۆز و بە پشتیوانی کۆمەڵەی یەکگرتووی هۆز پێکدێت.

تەنیا لە کۆتایی سەدەی ڕابردوودا، نەخشـی مێژوویی هـۆزی کـورد لە لێکۆڵینەوە کوردناسییەکاندا سـرنج و بـایەخی ڕاسـتەقینەی بـۆ لای خۆی راکێشاوە. پێشتر، زۆربەی هەڵسەنگاندنەکان بەتەواویی نەرێنی بـوون، چونکـوو پرۆسـەی یەکگرتـوویی نەتەوەیـی لە کوردسـتان هەمیشە لە بەرامبەر یەکگرتوویی خێڵایەتییدا داڕماوە. کلیلی ئاشکرا کردنی دیاردەی هۆزی کورد لە سرووشتی دیالیکتیکی ئەو ستروکتورە کۆمەڵایتیە دایە. دوو تەوەژمی (Potential) زۆر بەهێز لەو ستروکتورەدا لێکگرێـدراون: تەوەژمـی لێـک هەڵـبڕان و لەوەش بەهێزتـر تەوەژمـی یەکگرتن. لێرەدا یەکگرتـن کە لە هاوپشـتیی گشـتگیرانەی خێڵایەتیـدا خۆدەبینێتەوە، بایەخی سەرەکی پەیدادەکات.

تەوژمی یەکگرتوویی و خۆپاراستن کە لەناو خێڵدا شاردراوەتەوە، لێهاتوویی ژیان و توانایەکی لێنەبڕاوە دەداتە هۆز بۆ بووژانەوە و سەرلەنۆ بەردەوام بوون. لە هەلومەرجە زۆر دژوارەکانی کوردستان و لە کاتی شەڕ و پێکدادانەکان و وێرانکارییەکاندا کە مێژووی وڵاتی کوردان لێوالێوە لێیان، هۆز تەنیا ستروکتورێکی کۆمەڵایەتی بووە کە لە چیاکانەوە، واتە لە پانتایی ژێر دەسەڵاتییدا، توانیوێتی هەلومەرجەکە کۆنترۆڵ بکات. هۆز بۆ کورد پەناگای ئابووری، سیاسی و هزری بووە. کورد تەنانەت وەک کەمایەتییەکی نەتەوەییش زۆر بە دژواری دەیتوانی پارێزگاری لە خۆی کردبا، ئەگەر لە هەلومەرجە ئاستەمەکانی مێژووی خۆیدا نەیتوانیبا دەستی بگاتە چیاکانی، ئەو شوێنەی کە هەمیشە بۆ هۆز و رەوەندی کورد، قەڵا و پەناگا بووە.

هۆز ستروکتورێکی کۆمەڵایەتی-سیاسییە کە گەشەی کۆمەڵایەتی تێیدا لە ئاستی هەرە نزمدا نییە. پرسەکە لە ئالۆز نەبوونیدایە. باشترە بڵێین ئاڵۆزیی تێدا هەر بەدی ناکرێ. لەو روانگەوە هۆز پێکهاتەیەک نییە تەنیا "پاشەرۆک" یان یادگارییەکانی سیستەمی بەرە-خێڵی بە بەردەوامی پاراستبێت، بەڵکوو، سیستەمێکی سادە و ساکارە، بۆیە مۆدێلێکی چالاک (Mobile) و ژیانمەندی کۆمەڵایەتی-سیاسییە. هەر بۆیە کاتێک ستروکتورێکی کۆمەڵایەتی-سیاسی هێندێک ئاڵۆزتر لە کوردستان شکستی هێناوە، واتە میرنشینەکانی کورد بەرەو نابودی چوون، خێڵ توانیوێتی خۆی بپارێزێ و بەردەوام بێ.

## شەڕەفخان بتلیسی (١٥٤٣-١٦٠٣/٤)

لە "شەڕەفنامە"، کتێبی شەڕەفخان بتلیسی مێژوونووسی مەزنی کورد لە سەدەی 16دا، هۆزەکانی کوردستان شوێنێکی شایستەیان هەیە. نووسەر هەر لە دەستپێکی ئەو کتێبەوە باسی پێکهاتنی هۆزی کورد و داب و نەریتەکانی دەکات. بۆ شەڕەفخانی بتلیسی، قەومی (Ethnicity) کورد لە دەرەوەی ئەو ستروکتورە مانای نەبووە.

هۆزەکان پێشاندەر و وێنای هێز و توانای سەربازیی گەلی کورد بوون و "لەنێو حوکمڕانانی کوردستاندا ئەوانەی کە پشتیان بە هۆز و خێڵە بەهێز و پڕئاپۆراکان دەبەست، ناوی عەشیرەتەکانی خۆیانیان لە دەسەڵاتەکەیان دادەنا، وەک حوکمڕانییەکانی هەکاری، سۆران، بابان و ئەردەڵان. ئەو دەسەڵاتانەش کە خاوەن قەڵا و یان شارە مێژووییەکان بوون، بە واتای ئەو شوێنانەوە دەناسران..." (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل. ٨٧)

١٤ بەشـــی "شـــەرەفنامە" تەرخـــانکراوە بـــۆ هـــۆزە مەزنەکـــانی کوردســـتان: هـــۆزە یەکگرتووەکـــانی کەڵهـــوڕ، برادۆســـت، دومبـــولی، موکری، مەحمودی، سولێمانی، سوێیدی، زرقی، میرداسی، پازوکی، زەنگەنە، شـێخ مەنسـور، زەرزا، ئاسـتونی. شـەرەفخان لە پێرسـتی کتێبەکەیـدا، بـڕگەی ٢ لەبەشـی ٩ی تەرخـان کـردووە بـۆ ئیـزەدییە ئازاکـانی هـۆزی داسـنی[١]، بەڵام لە نێـو تەواوی دەستنووسـە ناسراوەکانی شـەرەفنامەدا کە لەبەر دەسـت دان، ئەو بەشـە بـوونی نییە. لەوانەیە ئەو بەشە هەر نەنووسراییت.

هێنـدێک لە هـۆزە مەزنەکـانیتری کوردسـتان کە "شـەرەفنامە" باسـیکردوون، لە پێرسـتی ئەو مێژوونـامەیەدا ئامـاژەی پێنەکـراوە. لە پێرستدا، شـوێنی گرینـگ و سـەرەکی دراوە بەو سلسـلە و خـانەدانە بەناوبانگـانەی کوردسـتان کە هـۆزە هەرە مەزنەکـانی کوردسـتان پشتیوانیان بوون. ئەگەرچـی ئامـاژە بە هێنـدێک لە هۆزەکـان نەکـراوە، بەڵام دیـارە لەبیـر نەکـراون و بەلانـی کەم لە لابەلای لاپەڕەکـانی ئەو کـتێبەدا باسـیان کـراوە. سـەبارەت بە هۆزەکـان، نووسـراوەکەی شـەرەفخان هەڵگری گەلێک زانیـاری گرانبەهـا و بێـوێنەیە. شـەرەفخان لەپێش هەمواندا باسی بۆهتی [بۆتان] دەکات، کۆمەڵە خێڵانێکی زۆر مەزن کە لە قۆنـاخێکی دوور ودرێـژدا هـۆزێکی یەکگرتـوو پێکـدێنن و لە نـاوچەی مێژوویـی جزێـر، واتە لە میرنشـینی بۆهـتی لە ناوەڕاسـتی کوردسـتاندا ژیـاون. (بە کـوردی بۆتـان) [لەمەودووا هەر بۆتـان بەکـار

[١] بەوتەی رەشید میران، هۆزی "داسنی" بە "ئیزدییەکان" گوتراوە. بڕوانە (رەشید میران، ٢٠٠٣، ل. ٦٥).

دێـت]. شــەڕەفخان ئەو نـاوچە مێـژووییەی بە نـاوی هـۆزی بۆتـان، بە "ولایەتـی بۆتـان" نـاوزەد دەکـات. بـۆ نووســەری "شــەڕەفنامە"، نـاوی خانەدانی دەســەڵاتدار و نـاوی هـۆزی پشــتێوانی خـانەدان، هەروەهـا ناوی ناوچەی ژێـر دەســەڵاتیان، یەک واتـای هەبـوو: خـانەدانی بۆتـان، هۆزی بۆتان و وەلایەتی بۆتان.

پاش پەیدابوونی ناوەکانی "هۆزی بۆتان" و "سـلسـلەی بۆتـان" کە بەپێیێ زۆربەی بۆچوونەکان هاوکات پێکهاتوون، واتای "ویلایەتی بۆتـان" وەک ئەو ناوچەیەی کە خـانەدانی میرنشـین خـاوەنی بـوون، هـاتووتە گــۆڕێ. هەڵکشـــانی ماڵباتەکـــان بـــۆ وەدەســـتهێنانی دەســـەڵاتی سـیاسـی، لە کوردسـتانیش وەک هەمـوو شـوێنەکانی دیکە لە ڕێگـای هێز و توانای هۆزێک یان کۆمەڵێک لە هۆزەکـان ڕەخسـاوە. لە لایەکـی دیکەوە، هزری هێنانەکایەی سیاسـی "سلسلەی بۆتان"، ڕێـک تـوانی ژمارەیەکی زۆر لە خێڵەکان و لکوپۆیەکانی لەژێر پەڕوباڵی خـۆی بگـرێ و هۆزێکی یەکگرتوو وەک "هۆزی بۆتان" پێکبێنێت.

"هۆزی بۆتان" یەکێک لەو زۆربە هـۆزە سـەردەمیانەی کـاتی خـۆی بـــوو کە لە ژیـــانی سیاســـیی نـــاوچەکە بەشـــداریکردووە و لەلایەن ســـەرچاوەکانی ســـــەردەمی "خەلافەت" باســـیکراوە. قەڵا پتەو و تـــۆکمەکەی دەســـتەڵاتدارانی بۆتـــان لە بـــاکووری شـــاری جزێـــر، بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگـری دەسـتەڵاتی درێژخـایەنی ئەو هـۆزەیە. هـــۆزی بۆتـــان بەپێـــی نووســـراوەکانی شـــهاب الـــدین العـــۆمەری، مێژوونووســـی عەرەب لە ســەدەی 14ی زاینــی، ڕکـابەرایەتیی لەگەڵ

هـۆزی توانـا و بەهێـزی حەمیـدی (حۆمەیـدی) کـردووە (EI2, 1981,[1] fasc. 85–86,Vol. V, P. 456).

جێــی ئامــاژەیە کە لە لاپەڕەکــانی پەڕتــوکەکەی شــەڕەفخانی بتلیسییدا لە هێندێک شوێن وەک هۆزی بۆتان و هێندێک جاریش وەک هۆزەکانی بۆتـان ناویـان لێـدەبات (شــەڕەفنامە، ١٩٦٧، ڵ. ١٧٥، ١٧٧، ١٨١، ١٨٣-١٨٥، ١٩١، ١٩٥، ١٩٧، ٢٠٠)، لێــرەدا هیــچ هەڵە یــان کەمتەرخەمییەک رووی نەداوە. بۆ نووسـەری شـەڕەفنامە، هۆزی بۆتان (هەر وەک هــۆزە مەزنەکــانی دیکەی کوردســتان) چ وەک کــۆمەڵە هۆزێــک و چ وەک هــۆزێکی یەکگرتــوو، هاوتــایە لەگەڵ ســەرجەم لکوپۆپەکانی گشــت خێڵەکـانی بۆتـان کە هەم یەکگرتـوو بـوون و هەم لەهەمان کاتدا هەریەک ســەربەخۆ. شــەڕەفخان "لە نێـوان خێڵەکـانی کوردسـتاندا" ئاماژە بە "هـۆزی بۆتـان" و نە "هۆزەکـانی بۆتـان" دەکـات واتە زۆر بەئاشــــکرا بۆتانییەکــــان وەک هــــۆزێکی یەکگرتــــوو هەڵدەسەنگێنێ.

کاتێـک باســی بۆتانییەکـان دەکـات، وشــەکانی مێژوونـووس پـڕە لە شــانازی و فەخــر. بۆتانییەکــان بە پیــاوەتیی، بــوێریی ســەربازی و بەتــایبەت لە ئەســب ســواریی‌دا زور بەناوبانــگ بــوون. بۆتانییەکــان لەشەڕەکانیاندا بە چەکوچــۆڵی گرانبەهــا، ئەســبی عەڕەبــی، شـەمشیری میسـریی، خەنجەری دێمشـقی گرینگێکـی زۆریـان داوە. لەرۆژی تەنگانە و لە بەرامبەر دوژمناندا لەرێزێکـی یەکگرتـوو و پتەودا و بەبــێ ســڵکردن راوەســتاون. بە وتەی نووســەری شــەڕەفنامە، لەو

---

[1] EI2= The Encyclopaedia of Islam. New edition. Leiden–London

ڕوانگەیەوە بۆتانییەکان لە "نێوان هاوتاکانیان لە گشت کوردستاندا" جیا دەکرانەوە (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل. ١٧٥، ١٧٦)، جێی ئاماژەیە کە دەستنیشانکردنی پلە وپایەی پیاوەتی و خۆڕاگری لە نێوان خێڵەکانی کوردستاندا کارێکی ئاسان نییە، تەنانەت بەپێی وتەکانی شەرەفخانیش ڕادەی پلەوپایەی شەرکەریی گشت کوردان و بەتایبەتی هۆزەکانی کورد، جیاواز بووە.

ئازایی و گەورەیی هۆزی بۆتان هەلی مەزنبوون دەرەخسێنێ بۆ ماڵباتییێک کە دەبنە خانەدانێکی بەناوبانگی کوردستان و پێشاندەر و نموونەی کوردایەتی. ئەو خانەدانە هەروەها پاشان دەبنە وێنای ڕەسەنایەتی و دەسەڵاتی میرایەتی و بە ناوی بنەچەی ناوداری خۆیان [بەدرخان]، بە خانەدانی بەدرخانییەکان ناوبانگ دەردەکەن.

شەرەفخان بۆمان دەگێڕێتەوە کە چۆن خانەدانی میرەکان بە پشتیوانی هۆزی بۆتان توانیان قورسایی سیاسی خۆیان زیادتر بکەن و ببنە خانەدانێکی مەزن و بەتوانا. لێرەدایە کە بە پێی بەهێزبوون و بەرزبوونەی پلەوپایە و وەدەستگرتنی دەسەڵاتی سیاسی، خانەدانی حوکمڕان دەستیاندایە شێوازەکانی دوورکەوتنەوە لە بنەچەی کۆمەلگای خێڵایەتیی بۆتان و تەنانەت لە رووی ئەتنیکیشەوە دوورکەوتنەوە لە بنەچەی خۆیان[١]. بنەچە نامە (شەجەرە نامە)ی خۆیان دەگەیەنە ناوی سەرداری عەڕەب، خالید بن وەلید،

[١] بۆ زانیاری پتر سەبارەت بە هەوڵی گۆرینی بنەچە و خۆ بە بێگانە زانینی زۆربەی خانەدانە حوکمڕانەکانی کورد، بڕوانە: ڤاسیلیەڤا، "دەقێک سەبارەت بە دەستکارییەکانی پیاوماقوڵانی خانەدانە کوردەکان بۆ لکاندنی بنەچەیان بە "بێگانە" وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی". لە پەڕتووکی "بەڵگەنامە یاردگارییەکان و کێشەکانی مێژووی کولتوریی گەلانی رۆژهەڵات. بەرگی ٢٤، بەشی ١، چاپی مۆسکۆ، ١٩٩١".

خوشەویستی محەمەد، پێغەمبەری ئیسلام و بەو شێوەیە ئاستی شانی خانەدانی خۆیان دەگەیەنە رادەی شانە پیرۆزەکان.

بەپێی نووسراوەکانی شەڕەفخان، دەکرێ بڵێین کە هۆزی بۆتان بەردەوام پشتیوانێکی بەهێزی خانەدانی میرنشینەکەی بووە و لەبەرامبەر هەر مەترسێکی دەرەکییدا، بەغیرەتەوە بەرگریی لێکردووە. کاتێک کێشەی دەسەڵات لە میرنشیندا هاتووتە گۆڕێ، هۆزی بۆتان بەتەواوی هێز و توانایەوە لە هەمبەر ئەو مەترسییانەدا کە لە دەرەوە هەڕەشەی لێکردووره، بوێرانە و بە بێ رەچاوکردنی لایەنی مەترسییەکە، ڕاوەستاوە. خانەدانی میرانی بۆتان و کۆمەڵی یەکگرتووی هۆزانی بۆتان بە یەکەوە دیاریکەری ئاڕاستەی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و سیاسیی میرنشینی بۆتان بوون. خانەدانی میرانی بۆتان لەسەرەوەی گشت ستروکتورە کۆمەڵایەتییەکانی میرنشیندا، حوکمڕانی هۆز بووە، هۆزیش وەک تەوەرەییەک کە بەشێوەیەکی دیار [concrete] ژیانی کۆمەڵایەتی-سیاسیی تێدا ورد و بەرجەستە دەبووە، پالپشتی لە خانەدانی میران و پەیوەندییەکانی کردووە.

وەک شەڕەفخان باسی دەکا، لەبەرامبەر مەترسییە ناوخۆییەکان و کێشەی وەدەستگرتنی دەسەڵات لە لایەن باڵە جیاوازەکانی ماڵباتی حاکم، هۆزی بۆتان نەیتوانییەوە بەرگریی لێبکات، تەنانەت زۆر جار هۆز بۆتە گۆڕەپانی بڵاوبوونەوەی ئەو ململانییە ناوخۆییانە. کێشەکانی بەمیرات بردنی دامودەزگای میرنشین بەپێی هەڵوێستی کۆمەلەی یەکگرتووی هۆز بڕیاری لەسەر دراوە کە بە بێ ئەملاو ئەولاش تەنیا

خانەدانی میری گرتووتەوە، واتە ماڵباتی میرنشین جێگۆڕکێی نەبوو.

خانەدانی دەسەڵاتداری بۆتان و هۆزی بۆتان بە درێژایی مێژووی خۆیان رووبەڕوی قۆناخی زۆر دژوار بوونەتەوە، لەوانە کاتێک نزیک بە نیو سەدە لە میژوویان دەکەوێتە بارێکی ئاڵۆز و نادیار. ئەوەش پاش هێرشی میر تەیمور بۆ سەر قەڵای جزێر و وێرانکردنی، و لەناوبردنی ناوچەی بۆتان روودەدات. شەڕەفخانی بتلیسی زۆر وردبینانە ئەو بارودۆخە ئاڵۆز و دژوارەی کاتی دەسەڵاتداریەتی دوو لە میرانی بۆتان باس دەکات. لە کاتی هاتنە سەر کاری حەسەن بەگی ئاق قۆینلوو [ئۆزۆن حەسەن] (١٤٥٣-١٤٧٨)، هۆزی بۆتان سەربەخۆیی خۆی بەئاشکرا ڕاگەیاند و لە بەرامبەر فشاری حەسەن بەگدا، بە بەرگریی هەمەلایەنە وەڵامیان دایەوە. لە ئاکامدا بۆتان لە لایەن تورکانی ئاق قۆینلوو داگیر کرا. وەک شەڕەفخان دەنووسێ، بۆتان و جزێر بە درێژایی ٣٠ ساڵ بە "ئەوپەڕی ناهۆمێدی و بێدەرەتانی"[١] دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئاق قۆینلوو (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل. ١٨٤).

لە شەڕەفنامەدا هاتووە کە بەشی هەرە زۆری بەگزادەکانی هۆزی بۆتان دەکوژرێن، نوێنەرانی خانەدانی دەسەڵاتدار و خۆدی میری بۆتان، دەست و پێیان زنجیردەکرێ و دەخرێنە بەندیخانەکان. هۆزی بۆتان لێکدەپرژێ و پەرش و بڵاو دەبێتەوە. کاتیک "خۆری دەسەڵاتی بەهێزی ئاق قۆینلوو کەوتە قۆناخی ئاوا بوون"، میر شەرەف رێبەریی بەرگریی بۆتانییەکانی دەگرێتە دەست و بە یەکخستەوەی بۆتانییەکان

---

[١] وەشەکانی نووسەر پڕ لە داخ و پەژارە، هۆزی رۆژکی و میرنشینی بتلیس کە شەڕەفخان بۆخۆی لەو ماڵباتە بووە، دوچاری چارەنووسێکی هاوشێوە دەبن کە لە درێژایی ئەو باسەدا ئامازەی پێدەکەین.

دەستپێدەکات. میر شەڕەف "گشت کەسانی زیندووماوەی هۆزی بۆتان"ی لە ژێر ئاڵای خۆی کۆدەکاتەوە (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل، ١٨٣، ١٨٤), بەپێی دوایین بەشی ئەو ئامـاژەیەی شەڕەفنامە، دەکرێ جەخت سەر ئەوە بەکەینە کە سەرکوتی بێبەزەییانەی ئاق قۆینلوو تەنیا بەگزادەکان و خانەدانی دەسەڵاتداری هۆزی بۆتانی نەگرتبووە، بەڵکوو هەموو ئەندامانی کۆمەڵە هۆزی بۆتانیشی کردبوو بە ئامانجی خۆی.

میر شەڕەف بەپشتیوانی هێز و توانا کۆکراوەکەی هۆزی بۆتان توانی "ویلایەتی بەمیراتگەیشتوو بەخۆی" رزگار بکات و لەکۆتایی سەدەی ١٥دەبێتە حوکمڕانێکی سەربەخۆ. بەڵام کار ناگاتە ئازاد کردنی برا و مامەکانی میر شەڕەف لەزیندان، کە هەمدیسان دوژمنێکی ترسناکی دیکە لە بەرامبەر خانەدانی حوکمڕان و هۆزی بۆتان بەناوی سەفەوییەکان زەق دەبێتەوە.

شا ئیسماعیل سەفەویی (١٥٠١-١٥٢٤) پاش هێرش بردنە سەر ئاق قۆینلوو، دەست بەسەر ناوچەکانی کورد لە دیاربەکر، مۆسڵ، سنجار [شنگال] دادەگرێ و هێزەکانی رەوانەی جزێر دەکات. لە نێوان سپای قزلباش و هێزەکانی هۆزی بۆتان شەڕ و پێکدادانێکی زۆر روودەدات و وەک شەڕەفخان ئامـاژەی پێدەکات، لە تەواوی ئەو شەڕانەدا میر شەڕەف و بۆتانییەکان سەرکەوتن وەدەست دێنن. لە یەکێک لەو شەڕانەدا، ١٠٧٨ قزلباش دەکوژرێن و ژمارەیەکی زۆر بەدیل دەگیرێن. پاش سێیەم هێرشی بێ ئاکامی سوارانی شەڕکەری قزلباش بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میر شەڕەف، شا ئیسماعیل

ئیـتر تـا مەرگـی میـر شــەڕەف، هیـچ هێرشـێکی‌تر ناکـاتە ســەر ئەو ناوچانە. تەواوی ژیانی میر شــەڕەف لەپێنـاو خەبـات بـۆ ئازادی بۆتـان و یان ئامادەکردنی ئەو خەباتە تەرخان کراوە.

وەک شــەڕەفنامە بـاس دەکـات، شــا عەلـی بەگ، جێنشــینی میـر شـەڕەف، لە ڕێژەی ٢٠ میرەکەی کوردسـتان بـوو کە چـوون بـۆ دیـداری شــا ئیســماعیل. هەمــوو ئەو ٢٠ ســەرکردانە ئامــادەیی خۆیــان بــۆ خزمەتکـردن بە شـای سـەفەوی رادەگەیەنـن، بەڵام بە فەرمـانی شــا ئیســماعیل دەسـتبەســەردەکرێن و دەخرێنە زینـدان. ناوچەکـانی ژێـر دەسـەڵاتیشـان پێشـکەشـی پیاوەکانی شـا دەکرێـن. عەلـی بەگ پـاش ڕزگاربوونی لە زیندان، هێرش دەباتە ســەر سـپای قزلبـاش و نـوێنەری شـا لە دەسـەڵات لادەبا و دەسـتبەسـەری دەکات، پاشـان لەگەڵ میـری بتلیـس، واتە بــاوەگەوەرەی نووســەری شـــەڕەفنامە، میــر شـەڕەف، لەسـەر بنەمای برایەتیی یەکێتیی پێکدێنن. لەمەو بەدووا، عەلـی بەگ ئیتر سیاسیەتی خۆی بەرەو ئاڕاسـتەی سـوڵتانی تورک دەباتە پێش.

لەلایەن میـــری بۆتـــانەوە و بەنـــاوی ئەو بـــرایەتییەی لەسـەرەوە باسـمان کرد، بەردەوام دەسـتێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی میرنشــینی بتلیس کـراوە، بەتـایبەت کاتێـک چارەسـەرکردنی کێشـەی میراتگریـی جێنشـینانی میری بتلیس هاتۆتە گۆڕێ. پێداگری بۆتانییەکـان لەپێنـاوی ئەو مــافەدا بــۆتە هۆکــاری نــاکۆکی و پێکــدادانی بەردەوام لە نێــوان هۆزەکانی بۆتان و ڕۆژکی.

دەسـتێوەردان لە کاروباری جێنشینی تەختی دەسـەڵاتی میرنشــین لە بتلیس، بەردەوام هۆزی بۆتانی خسـتووتە شـەڕ و کێشـە لەگەڵ ئەو

بەشە لە هۆزی رۆژکـی کە لە بـاڵە دژبەرەکـانی نێـو خـانەدانی حـاکم پشـــتیوانیان کــردووە. بەو هــۆیەوە، نــاکرێ بە یەک پێــوەر پەیوەنــدییە خێڵایەتییەکـانی نێـوان ماڵبـاتە دەسـەڵاتدارەکان لە بتلیـس و جزێـر هەڵسەنگێنین. بێگۆمان ئەو دوو لایەنە بەرژەوەندی هاوبەشی یەکجـار زۆریـان لەگەڵ یەک هەبـوو. بەڵام شــەڕەفخان بە شــانازییەوە باســی عەشــیرەتی بۆتـان دەکـات و دەڵێ نـاوی بۆتـان لەلای کـوردان وێنـای غیرەت و بوێری سەربازی بووە (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ڵ. ١٧٥).

شــەڕەفخان لە کۆتـایی ســەدەی ١٦ و هاوکـات لەگەڵ نووســینی "شەڕەفنامە" کە هاوچەرخە لەگەڵ دەســەڵاتی میـر شــەڕەف، ئەو بە "حاکمێکی رەسەنی جزێـرێ" و بە میـرێکی ســەربەخۆ (شــەڕەفنامە، ١٩٦٧، ڵ. ٢٠١، ٢٠٢) هەڵدەســــەنگێنێ و دەڵــــێ، ئەو ســــامان و داراییەی کە میـری جزێـر هەیبـوو، هیچکـام لە حاکمـانی کوردســتان نەیانبوو.

شەڕەفخانی بتلیسی بەوپەڕی هەستەوە، دیارە زۆر سرووشتییە - باسی هۆزی رۆزکی (بەکوردی رۆژکـی) وەک پشــتیوان و پاســەوان و پێکهێنەری خانەدانی میرانی بتلیس دەکات کە خۆشــی یەکێـک لەوان بـووە. وادیـارە شـێوازی پێکهـاتنی یەکگرتـوویی عەشـیرەتی لە هـۆز و بنهۆزەکانی هۆزی رۆژکی بۆ داگیرکردنـی بتلیـس و هەرێمـی بتلیـس، نمـونەیەکی کلاسـیکیی بێـت لە پێکهـاتنی کـۆمەڵەیەکی یەکگرتـووی عەشیرەتی.

داگیرکردنی بتلیس و ناوچەکەی، رووداوێکی زۆر ئاڵـۆز و خێـرا بـووە. هــۆزانی کــورد، کە هێنــدێکیان هەر سەر بە نــاوچەکە بــوون ("هــۆزە

دێرینینییەکـــانی ویلایەتـــی بتلیـــس”) و هێندێکیشـــــان کە لە وتەی مێژوونووس دەردەکەوێ لە ناوچەکانی دیکەوە هـاتبوون، "لە رۆژێکـدا"[1] کۆدەبونەوە و ناوچەکە لەناو خۆیانـدا دابەشـدەکەن، واتە پێکـدێن کـێ، خـاوەنی کـام نـاوچە بـێ. لەهەمـان کاتـدا سـەرۆکێک هەڵـدەبژێرن لەسەرووی هەموو ئەو کۆمەڵە یەکگرتووە عەشیرەتییە بێت کە پێکیـان هێنابوو.

کـــار بـــۆ داگیرکردنـــی بتلیـــس خێـــرا دەســـتپێدەکات. تـــاکتیکی داگیرکـــردنەکە ئەوەنـــدە رێکوپێـــک دەبـــێ کە رۆژکییەکـــان زۆر زوو بە مەبەســتی خۆیـان دەگەن و لە نـاو بتلیســدا جێگیـر دەبـن. یەکێـتیی ســـەربازی-ستراتیژێکیی هۆزەکـان وەرچەرخـان بەخـۆیەوە دبینـێ و دەگاتە ئاستی کۆمەڵەی یەکگرتووی عەشیرەتی. لەسەرەتا هاوپشت دەبن لە دژی هەموو ئەو لایەنانەی کە خاوەنی هەرێمی بتلیس بـوون و پاشـــانیش دیـارە لە دژایـتیی لەگەڵ ئەو کەســانەی دەیانەویســت دەسەڵاتی ئەو ناوچەیە بگرنەوە دەست. ئەو کەسانەش کەم نەبوون. ئەو ناوچەیە بەهۆی بەروبوم و هەڵکەوتەی ســتراتیژێکیی، زۆر جێگـای بایخ و سرنج بووە.

پـاش مـاوەیەک، لەنێـو کـۆمەڵەی یەکگرتـووی عەشـیرەتی رۆژکیـدا دووبەرەکی دەســت پێـدەکات، "هەمـوو شـتێک لە هۆزەکـانی رۆژکیـدا یەک لە دووای یەک دەستیان پێکرد و کەس بە گوێ کەسـی نەدەکرد" (شەڕەفنامە. ١٩٦٧، ڵ. ٤٠٤), ئەو کەسـەی بـۆ سـەرۆکایەتی هەمـوو

---

[1] ئەوەیە شێوازی پێکهاتنی (ئێتیمۆلۆژی) ناوی کۆمەڵگایەکی عەشـیرەتی بەپێـی دابونەریـتی ناوچەکە، رۆژکی = رۆژ ئێکی

هۆزەکـــان دانرابـــوو، دەمـــرێ و  کەســـی‌تر بـــۆ جێنشـــینیی خـــۆی دەستنیشان ناکات. دیارە ئەو کەسەش بێگۆمان دەبا سـەر بە یەکێـک لە هۆزەکـــانی کـــۆمەڵەی یەکگرتـــووی عەشـــیرەتی بـــێ. لەو هەلـومەرجەدا، بەوجـورە لـە نووسـراوەی شـەڕەفخان تێـدەگەین کە جێگـری راسـتەقینەی سـەرۆکایەتی کـۆمەڵەی یەکگرتـووی هۆزەکـان دەبوو ئەو کەسـە بـێ کە بە هیچکـام لە هۆزەکـان بەسـتراوە نەبـێ و هاوکـاتیش لە هەمـوو هۆزەکـان بەیەک شـێوە دوور بـێ. لێـرەدایە کە سـەرۆک هۆزەکـانی رۆژکـی دەگەنە قەنـاعەتی پێکهێنـانی خـانەدانی حـوکمڕان تـا ئەو مەرجـانەی تێـدا بێـت. دوو بـرا کە  بە رەچەڵەک دەگەیشنتەوە پاشاکانی ساسـانی دەستنیشـانکران و یەکێـک لەوانە کرا بە میر کە وەک ئەفسانەیەک شەڕەفخانی بتلیسیی دەیگێـڕێتەوە، لە ئاکامدا یەکێک لەو برایانە دەبێتە حاکمی بتلیس، و ئەوی‌تر حـاکمی خەزۆ [لە ناوچەی جزێر].

گرینـگ نییە چەنـدە داسـتانی بـوونی ئەو دوو برایـە و پەیوەنـدیی بنەچەیان بە ساسانییەکان راست بێت، گرینگ لەو هەلـومەرجە کە لە شەڕەفنامەدا زۆر بە جوانی و  دووررودرێژیش باسکراوە، ئاکامەکەیەتی. هـۆزی رۆژکـی خانەدانێـک بـۆ دەسـەڵات بۆنیـاد دەنـێ و حـوکمڕانی بتلیسی پێدەسپێرێ و تێدەکوشی سـیما و رووخسـارێکی شـاهانەی پێ بدات. بۆ سازکردنی قارەمانەکان راسـتی و درۆسـتیی رووداوەکـان زۆر گرینـــگ نییـــن و وەک لە گێـــڕانەوەکەی دەردەکەوێ، نووســـەری رووداوەکەش لەو ڕاستییە باش تێگەشتووە. قارەمانێک سـازدەکرێ کە "کارتێکەریی" دەبی لە رازاندنەوەی سیمای خانەدانێک و خزمەت دەکا

بـۆ مەزنکـردنەوەی نـاوی ماڵباتێـک. ماڵبـاتی حـاکم مەزنـتر دەبـێ لە هەمـوو پێکهاتەکـانی هـۆز و بەیەک ئەنـدازەش دوور دەبـێ لە هەمـوو بەشــەکانی ئەو پێکهـاتەیە. ئەو کەسـە دەکـرێ بەحـوکمڕان و هـۆزی ڕۆژکیش دبیتە خزمەتکارێکی بەتوانا و بەئەمەکی ئەو حوکمڕانە.

هـۆزی ڕۆژکـی دەبێتە پاڵپشــتی خـانەدانی میـر، کە شــەرەفخانی بتلیسـیش ئەنـدامێکی ئەو خـانەدانەیە. لە کۆتـایی سـەدەی ١٦ و لە کاتی نووسینی شــەرەفنامەدا، ئەو هـۆزە ٢٥ خێـڵ لەخـۆ دەگـرێ. دوو باڵی "بلبـاس" و "قـوالیس" بریـتی دەبـن لە ٢٠ خێـڵ و ٥ خێڵیتریـش وەک "کۆنــترین هۆزەکـانی ویلایەتــی بتلیــس" شــوێنێکی تایبەتیــان هەبـووە. لەوانەیە مەبەســت لە دامەزرانـدنی سیســتەمی دوو بـاڵ و چەند یەکەی خێڵی تایبەت و تەنـانەت ژمـارەی هـۆزە دابەشــکراوەکان لەو سیستەمەدا، بۆ ڕێکـوپێکردنی ژیـانی عەشـیرتی و پێشــگیریی لە ململانییە عەشیرەتییەکان بووبێت.

دوو باڵی هۆزی ڕۆژکی زۆر بەئاشــکرا ڕکـابەری یەکـتر بـوون و وەک یەکەیەکــــی یەکگرتــــوو نەهەمیشــــە لەگەڵ یەک حــــاواونەوە. ئەو ڕکابەرایەتییە کاتێک زۆر بە زەقـی خـۆی پێشـاندەدات کە گۆڕانکـاری لە پێکهاتەی میرنشین پێویست بووبێت. هەر دوو باڵی هۆزی ڕۆژکـی بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەی جێنشـینی میـر کەڵکیـان لەکاریگەرییەکـانی خۆیــان وەرگرتــووە. شــەرەفخان نمــونەیەکی زۆر بەرچــاو لەو بــارەدا بەجوانی باسدەکات.

لە ســاڵی ١٤٩٣/٩٤ و پـاش مەرگـی میـری بتلیـس، دەســەڵات لە بتلیــس درا بە بــاڵی "قــوالیس" و میــر ئیــبراهیم بــوو بە میــر و

"بەڕێوەبردنی ئەرکە گرینگەکان کەوتە دەستی بەگزادەکانی قـوالیس" (شـــەرەفنامە، ١٩٦٧، ل. ٤٣٩، ٤٤٠)، ســـەرۆک هۆزەکـــانی بـــاڵی "بلبـاس" نـارزایەتیی خۆیـان دەردەبـڕن. شـێخ ئەمیـری بلباســی، ســـەرۆکی هەرە مەزنـــی بلباسەکان، بڕیـــاری کۆتـــایی دەدا کە کاردانەوەیەکی مەزنـی لەسـەر چارەنووسـی بـاوەگەورەی نووسـەری شـــەرەفنامە، واتە میـــر شـــەرەف بەدوواوە دەبـــێ. بەپێچەوانەی چاوەڕوانی هـۆزی قـوالیس، شـێخ ئەمیـری بلبـاس و عەشـیرەتەکەی هاتنە "خزمەت" میر شەرەف لە موش، ئەو شوێنەی کە میـر شـەرەف وەک جێگـری میرنشـینی بتلیـس لێـی دەژیـا. بەحەول و تێکوشـانی بلباسـەکان، میـر شـەرەف بەخـاوەن تەخـتی دەسـەڵاتی بتلیـس رادەگەینـدرێ. پـاش هـاتنی میـر شـەرەف بـۆ بتلیـس دەسـتبەجێ رێورەسمێکی رازاوە بە بۆنەی راگەیاندنی میـری نـوێ بەڕێـوە دەچـێ. شـێخ ئەمیـر بلباسـی بە دەسـتی خـۆی میـر ئیـبراهیم لە تەخـتی میرایەتی رادەکێشێتە خوار، پاشان دەستی میر شەرەف دەگرێ و بەو ئاواتەی کە "با ئێستا هەرکەس لە شـوێنی خـۆی دابنیشـێ" لەسـەر تەختی میرایەتی دادەنێ (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل.٤٤٠، ٤٤٤).

مخابن رووداوی لەو شێوەیە زۆر بەدەگمەن روویداوە. هـۆزی رۆژکـی بە هەموو لکوپۆکانی، زۆرجار لە خانەدانی میرایەتیی بەرگریی کـردووە و وەک پاسـەوان ماڵبـاتی میرانـی پاراسـتووە. خـانەدانی میرنشـینی بتلیس و هۆزی رۆژکی بەبێ یەکتر هێز و توانـای خۆیـان لەدەسـتدەدا. تەنـانەت ئەگەر خـانەدانی میرنشـین بـۆ مـاوەیەکیش دەسـەڵاتیان لەدەســـتدابا، کـــۆمەڵەی یەکگرتـــووی هۆزەکـــان خێـــرا دەکەوتنە

بێســـەرەوبەرەیی و پەرشـــوبڵاویی. بـــۆیە خـــانەدانی میرەکـــان وەک دەســـــتەبەر و گـــارانتیی بەردەوامیـــی ژیـــانی هۆزکـــان بـــوون و بە شــــێوەیەکی نەپچـــڕاو، فیـــداکارانە و لەخۆبردووانە سەرپەرەشــــتی هۆزەکانیان کردووە.

بۆ هۆزی رۆژکی، تەنیا ناوی ماڵباتی میرنشین راکێشەرێکی بەهێـز بوو بۆ راپەڕین و ئامادەکردنی هۆز بۆ رێکخستن و دامەزراندنی یەکێتی و یەکبوون. هۆزی رۆژکـی لە پێنـاو خـانەدانی میـر و دەسـتەبەرکردنی تەخـتی میرایەتیـان، تەنـانەت لەلێـواری هەلـدێری لێـک بڵاوبـوونەوە، دیسان هێزی تازەی کـۆکردووتەوە و لە پیناویـدا بەشــەر هـاتووە.  وەک لە نموونەکەی شەڕەفخانی بتلیسیدا سەبارەت بە مێژووی باوباپیرانی دەردەکەوێ، تەنانەت هێندێک جـار جـوامێری و پیـاوەتیی عەشـیرتی و تێکۆشـان بۆ بەردەوامبـوونی دەســەڵاتی خـانەدانی میـران لە ئامـادیی خۆدی خانەدانی دەسـەڵات بۆ وەدەستگرتنی دەسەڵات پێشدەکەوێ. واتە هۆز رۆڵی کۆڵەکەی سەرەکی و کارا دەگێڕێ.

لە شــەڕفنامەدا دەتـوانین نمـوونەی زۆر بەرچـاو بـبینیین کە کاتێـک ئاسۆیەکی روونی سیاسـی بۆ دەسەڵاتی خـانەدانی میرانـی بتلیـس لەپێشـچاو بەدی نەکـراوە، چۆنچـۆنی هـۆزی رۆژکـی ســەرلەنوێ ئەو دەســەڵاتیان بـۆ گەڕانـدۆتەوە. هەلـومەرجێکی ئاوا لە ســەدەی 15دا روودەدات، کاتیک میری بتلیس و هەروەهـا میرنشــینی بۆتـان دەکەونە دەست پیاوانی سۆڵتانەکانی ئاق قۆینلوو و دەسەڵاتی بتلیس و جزێـر بە دەستنیشاندەکانی سۆڵتانی "مەرسپی" دەدرێن.

شـەڕەفخانی بتلیسـی زۆر بە وردی و بە جوانی دەنووســێ، هـۆزی

رۆژکی چۆن دووباره پێکهێنانەوەی خانەدانی میرنشینی بتلیس دەخاتە ئەستۆی خۆی و هەنگاو بەهەنگاو، سەرلەنوێ پێکی دێنێتەوە. دڵسۆزانی هۆزی رۆژکی یەک بە یەک پاشماوەی ئەندامانی پەرشوبڵاوی ماڵباتی میر، تەنانەت میرمنداڵانیشیان، بە بێ رزامەندی دایکانیان. بە قەناعەت پێهێنان، بە پاڕانەوە، بە هێنانەوەی وتاری ئایینی کە لەخەودا پێیان گوتراوە، کۆیاندەکەنەوە. ناوی خانەدانی میر وەک ئاڵایەک بەرزدەکرێتەوە. بە ناوی خانەدانەوە، رۆژکییەکان سەرلەنوێ دەکەونە بەرخۆدان و لە پێکدادانەکاندا دەکوژرێن. ئەندامانی خانەدانی میرنشینیش دەبنە قوربانی، وەک لە یەکێک لەو شەڕانەدا، باوکی باوەگەورەی شەرەفخانی بتلیسی دەکوژرێ کە لە لایەن رۆژکییەکانەوە بانگهێشتکرابوو و لە بتلیس دانرابوو. سەرئەنجام لە ساڵانی ٩٠ی سەدەی ١٥دا، پاش هەوڵ و تێکۆشانی بەنرخی هۆزی رۆژکی، دەسەڵاتی خانەدانی میرنشینی بتلیس سەرلەنوێ دادەمەزرێتەوە.

لە سەدەی ١٦دا بۆتانییەکان و بۆتان، ماڵباتی میری بتلیس و عەشیرەتی رۆژکی دەکەونە ناوەندی ململانییەکانی ئێرانی و تورکەکان و هێزێکی زۆر لەدەست دەدەن و بە زەحمەت لە ململانییە کۆتایی لێ نەهاتووەکانی دوو زلهێزی ناوچەکە، ئیمپراتووریی عۆسمانی کە گەیشتبوو لوتکەی هێز و توانای خۆی و ئیمپراتووری سەفەوی کە لەسەر لێکگرێدانی دوو بیرۆکەی مەترسیداری ئیسلامی عیرفانی و هاوپەیوندیی عەشیرەتی تازە پێکهاتبوو، رزگاریان دەبێ. ئەو شەڕە تەوای خاکی کوردان دەتەنێتەوە، شەڕەکانی ئەو

دوو ئیمپراتـــوورییە، ژینگەی کـــوردانی بە دوو بەرەدا دابەشــــدەکات. حوکمڕانــانی کــورد بە گــۆڕانی هەڵوێســتەی سیاســییان تــا ١٨٠ پلە ناچاردەکرێن و دەکەونە هەڵوێستگۆڕین لە نێوان ئەو دوو بەرەیەدا.

پێگەی زۆر گرینگـــی ژێئۆجـــوگرافی وڵاتـــی کـــوردان، ســـۆڵتانە عۆســـمانییەکان و شـــیخە سەفەوییەکان هــان دەدا تــا بــێ بــڕانەوە هەلــومەرجی هەریەک لە میرنشـــین و عەشـــیرە کوردەکــان بەوردی بخەنە ژێــر چــاوەدێری. بەتــایبەت میرنشـــینی بتلیــس و عەشــیرەتی رۆژکی دەکەونە ناوەندی ئەو گرینگی پێدانە. بۆ نمـوونە دەکـرێ ئامـاژە بە ژیان و بەسەرهاتی شەڕەف خانی بتلیسیی و باو و باپیرانی بکەین (بڕوانە، ڤاسیلیەڤا، ٢٠٠٥).

مێژووی عەشیرەتی رۆژکی بە پێی "شەڕەفنامە" رێگامان پێدەدا تــا هاوسۆزی عەشیرەتی وەک دیاردەیەکی کـۆمەڵایەتی هەڵسەنگێنین. فەداکاریی و خۆبەخشـیی سەرسـوورهێنەری عەشـیرەتی رۆژکـی لە لانکەی هــزری خۆبەخشـــی عەشـــیرەتیدا لە دایکبـــووە. عەشـــیرەتی رۆژکی سەرەڕای نەبوونی گرێدراویی خوێنیی لە ناویانـدا، بەو خوێنـانە لێک گرێدرابوون کە لە بەرەکانی شەڕدا لە پێنـاو بەرژەوەنـدیی، توانـا و سەربەرزیی  هۆز و بە ناوی خانەدانی حـوکمڕانی میرنشـینی بتلیـس بەخشـــی بوویـــان. بە چاوپێداخشـــاندن بە نووســـراوە مێـــژوویەکەی شەڕەفخان سەبارەت بە هـــۆزی رۆژکـــی، دەتـــوانین بڵێیـــن کە لە نێـــو عەشـــیرەتی رۆژکیـدا هـزری هاوپشـتیی عەشـیرەتی گرینگیـی هەرە سەرەکی هەبۆوە، نەک هـــاوخوێنبوونی راســـتەقینە یـــان خـــوازراو و ســـازکراو. یەکگـــرتنەوە لە پێنـــاو یەکگرتـــوویی و یەکگرتـــوویی لە پێنـــاو

یەکگرتنەوە، سەرەکیترین ئامانجیان بووە.

باپیرانی شەڕەفخانی بتلیسی بەلانی کەم سێ جار سەربەخۆیی خۆیان راگەیاندووە، تەنانەت نووسەری "شەڕەفنامە" دراوی "درهەم" کە ناوی حاکمانی بتلیسی لەسەر بوو بە چاو خۆی بینیوە.

یەکێک لە مەزنترین شانازییەکانی شەڕەفخان، سکەی "شەمسەدینی" بووە کە لە سەدەی ١٤ و لە زەمانی حکوومەتی میر شەمسەدین "لە کاتی زۆر ئاڵۆزی، ململانی تورکمانەکان" رەواجی هەبووە و لە شارەکانی کوردستان بەناوبانگ بووە و خانەدانە مەزنەکان وەک "نیشانەی بەختەوەری بۆ گشت وڵاتی کوردان" پاشکوویان کردووە "شەڕەفنامە. ١٩٦٧, ل. ٤٢٢". ئەو دراوە وەک نۆشتە و دۆعا جێگای گرتبوو. ناکری لێرە ئاماژە بە بۆچوونی نووسەری "شەڕەفنامە" نەکەین کە چۆن بە گەلێک شانازییەوە باسی خانەدانی خۆی و هۆزی رۆژکی دەکات: "ئەگەر حاکمە مەزنەکان سەودای گرتنی کوردستانیان هەبێ، بێگۆمان لە یەکەم هەنگاودا لەگەڵ حاکمانی بتلیس و هۆزی رۆژکی رووبەڕوو دەبنەوە" (شەڕەفنامە. ١٩٦٧, ل. ٤٠٥).

لای شەڕەفخانی بتلیسی کۆمەڵگای عەشیرەتی رۆژکی دیاریکەری هێز و بەرخۆدان، توانا و مەزنایەتی بووە بۆ گشت وڵاتی کوردان. شەڕەفخانی بتلیسی سەبارەت بە عەشیرەتەکانی کورد ئاماژەی بە بابەتی زۆر سرنجڕاکێش کردووە. لێرەدا بۆ نموونە ئاماژە بە چارەنووسی عەشیرەتی مەلکیشی (هەمان عەشیرەتی چەمیشگەزەک) دەکەین. ئەو عەشیرەتەی کە لەگەڵ میرەکانی

خانەدانی حاکم، دۆچاری گەلێک چارەڕەشی و کوێرەوەری و کوشتن و بڕین و راگواستن دەبن و تەنانەت ناوی کۆمەڵگا عەشیرەتییەکەشیان گۆڕانی بەسەردا دێ. دیارە لایەنە شاراوە و نهێنییەکانی ئەو گۆڕانە ئاشکرایە و سەلمێندراون.

چەمیشگەزەک کۆمەڵەیەکی یەکگرتووی عەشیرەتی کوردە کە بەپێی شوێنی جێگیربوونیان لە ناوچەی چەمیشگەزەک (دێرسم) گۆران بەسەر ناویدا هاتووە. چەمیشگەزەک یان دێرسم ناوچەیەکی چڕوپڕی شاخاوییە. ئێستا ئەو ناوچەیە یەکێکە لە ناوچە پاشکەوتوو و کەم ئاپۆرا و پەراوێزخراوەکانی کوردستان (Bruinessen, 1992, p. 150).

بە پێی ئاماژەی شەڕەفخانی بتلیسی، لە کاتی دەستەڵاتداری حاکمانی چەمیشگەزەک کە نزیکەی سەد ساڵی خایاندووە، ئەو میرنشینە لەپانتاییەکی بەریندا ١٦ ناوچە و ٣٢ قەڵای لەخۆگرتووە و گەلێک بەتوانا بووە. وەک لە نووسراوەکانی "شەڕەفنامە" دەردەکەوێ، ئەو ناوچەیە لە پێش چاو دونیای دەرەوە، سیمبۆلی هێز و خۆڕاگری کوردستان بووە. بە پێی نووسراەکانی شەڕەفخانی بتلیسی، ئەو میرنشینیە لە کوردستاندا پانتاییەکی بەربڵاوی هەبوو کە "پیاوماقۆلان و خەلکی ئاسایی و بەتایبەت لە فەرمان و بڕیار و یاسا حکۆمییە شکۆدارەکانی خۆیاندا، ئەو وڵاتە بە کوردستان ناودەبەن، هەروەها لە دونیای کوردیدا هەر کاتێک ناوی کوردستان دێت، مەبەست چەمیشگەزەکە" (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل. ٢٢١).

لە لاپەڕەکانی "شەڕەفنامە"، ئەگەرچی لە بەشی حاکمانی

چەمیشــگەزەکدا باســی هــۆزی چەمیشــگەزەک نەکــراوە، بەڵام لە پێشەکی سەبارەت بە هــۆزی دومبــولی دا و لە بەشــی ســێەم "دەربــارەی میرانــی کــورد لە ئێـران"دا باســی ئەو هــۆزە دێتە گــۆڕێ. لەبەشــی "دەربــارەی حاکمــانی چەمیشــگەزەک"دا، باســی هــۆزی مەلکیشــی دەکــات. بەپێــی نووســراوەی شەڕەفخانی بتلیســی، کۆمەڵەی یەکگرتووی عەشیرەتیی میرنشینی چەمیشگەزەک رێک بەناوی کەسایەتی بەناوبانگ و دامەزرێنەری ئەو کۆمەڵە یەکگرتوویە، مەلکیشی ناونراوە.[1]

بەهەمان شێوە کە کۆمەڵەی یەکگرتووی عەشیرەتی رۆژکی لە سەدەی ١٠دا بــۆ دەستبەسەرداگرتنی بتلیــس پێکــدێت، هــۆزی مەلکیشیش بۆ بەدەستگرتنی دەسەڵاتی ئەو ناوچەیە پێکدێت کە پانتاییەکەی میرنشینی چەمیشگەزەکی دەگرتەوە.

پربڕەی پێکهاتەی هۆزی مەلکیشی بریتی بوو لە کۆمەڵەیەکی مەزن کە مەلکیشــی کۆیکردبۆووە. بە وتەی شەڕەفخان، ئەو پێکهــاتە عەشــیرەتییە لە ســێ بەش پێکــدەهات: "ئەوانەی کە لە تەواوی کوردستاندا بە هۆز و خێل و پیاو و لایەنگرانی پرئاپۆرا، بەناوبانگ بوون و پتر لە هەزار ماڵباتیان خزمەتکاری دەرباری شاهەنشاهی ئێران بــوون" (شەڕەفنامە. ١٩٦٧، ل. ٢٢١).

بەپێی "شەڕەفنامە"، پاشەرۆکی مەلکیشی سەردەمانی سەخت و دژواری چەنگیزخــان، میــر تەیمــوری گورخــانی، شــارۆخ میــرزا، قەرە

---

[1] وەک نووسەری "شەڕەفنامە" باســی دەکــات، نــاوی مەلیــک شــا بــووە و بەرەبەرە گــۆڕانی بەسەردا هاتووە و بۆتە مەلکیش.

یۆسف قەرە قۆینلوو تێپەڕدەکەن. لە کاتی هاتنە سەر دەستەڵاتی ئۆزۆن حەسەن ئاق قوینلوو، ئەزموونێکی دژوار هەم بۆ خانەدانی حوکمڕانی چەمیشگەزەک و هەم بۆ کۆمەڵەی یەکگرتووی هۆزی مەلکیشی دەستپێدەکات. ئەو سۆڵتانە تورکمانە بەمەبەستی "لەناوبردن و نابودکردنی" خانەدانی حکومرانی میرانی چەمیشگەزەک دەستدەکات بە داگیرکاری و لە ئاکامدا چەمیشگەزەک کران بە مریدی ئۆزۆن حەسەن. بەڵام شێخ حەسەن، میری چەمیشگەزەک، وەک شەڕەفخانی بتلیسی دەڵێ "ئەو کەسانەی لەو ناوچانەی کە بە میرات پێیان دەگەیشت" (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل. ٢٢٢) دەرپەڕاند و ئەو ناوچانەی دیسان وەدەست هێناوە.

هەر لە سەرەتای سەدەی ١٦ و پاش خامۆش بوونی دەستەڵاتی سیاسی ئاق قۆینلوو، سەفەوییەکان بەخیرایی بەرەو لوتکەی دەستەڵات لە ئێراندا هەڵکشان. سەفەوییەکان لە دەستپێکی جموجۆلی سیاسی خۆیاندا و تا ساڵی ١٥١٢، سنوری باکووری رۆژئاوای ئیمپراتوورییەکەیان گەیشتە ئۆرفا و چەمیشگەزەک و ئەرزرووم (Bruinessen, 1992, p. 139). بۆ داگیرکردنی چەمیشگەزەک، نور عەلی خەلیفە، میری قزلباش رەوانەی ئەو ناوچەیە کرا. حاجی رۆستەم بەگ، نەوەی شێخ حەسەن، حاکمی ئەو کاتی چەمیشگەزەک تەوای ١٦ ناوچە و ٣٢ قەڵای میر نشینی چەمیشگەزەکی رادەستی قزڵباشەکان کرد. بۆ ماوەیەک کۆتایی بە دەستەڵاتی ئەو میرنشینە هات. بەپێی نووسراوەی شەڕەفخانی بتلیسی، حاجی رۆستەم بەگ دەرچوو بۆ ئێران و بوو بە عەزیزی شا

ئیســـماعیلی یەکەم و بـــۆ قەرەبـــووی چەمیشـــگەزەک، حکـــوومەتی ناوچەیەکی عێراقی پێدرا.

کـــۆمەڵەی یەکگرتـــووی هـــۆزی مەلکیشـــی کەوتە بەر شـــاڵاوی تونـــدوتیژیی و سەرکوتکردن لە لایەن مریـــدانی شـــا ئیســـماعیلەوە و بەشـــێکی بەرچـــاوی مەلکیشـــییەکان (لەوانەش، پیاومـــاقووڵان، "میرزادەکـان") لەسـێدارە دران. چارەنووسـێکی رەشـیش چـاوەڕوانی رۆسـتەم بەگـی دەکـرد. رۆسـتەم بەگ لە سـاڵی ١٥١٤ و لە شـەڕی چالدرانـــدا لە بەرەی شـــا ئیســـماعیلی یەکەم بـــوو، کاتێـــک لە سەرئەنجامی ئەو شەڕەدا، شا پاشەکشەی کـرد و هەڵات، رۆسـتەم بەگ هەولـی دا "رکێفـی ئەسـپی سـوڵتان مـاچ بکـات"، بەڵام بە فەرمـانی سـوڵتان لەگەڵ چـوار کەس لە میرزادەکـانی مەلکیشـی لەسێدارە درا.

لە پەڕتووکی شەڕەفخانی بتلیسیدا دواجـار کە باسـی مەلکیشـی دێتە گورێ لە پەیوەندیدایە لەگەڵ سەردانی پیر حۆسـێن بەگ، کـوڕی حـــاجی رۆســـتەم بەگـــی لەســـیدارەدراو لەلایەن ســـوڵتانەوە کە بەهـاورێیەتیی ٤٠ کەس لە پیـاو مـاقوڵانی عەشـیرەتی مەلکیشـی دەچنە "بارەگـــای ئاســـمان ئاســـای " ســـوڵتان سەلیمی یەکەم. سـوڵتانی سەرسـوڕماو لە بـوێریی پیـر حۆسـێن بەگ، حکـوومەتی چەمیشگەزەکی بۆ دەگەڕێنێتەوە (دیـارە دەبـا نـاوچەکەی لە چەنگـی قزلباشەکان رزگار کردبا!).

لێـــرەوە بە شـــێوەیەکی چـــاوەڕوان نەکـــراو و گۆمانـــاویی لە "شەڕەفنامە"دا ئیتر باسـی کۆمەڵگای عەشیرەتی مەلکیشـی نـاکرێ

و ناوی عەشــیرەتی  چەمیشــگەزەک دێتە گـۆڕێ (شـەڕەفنامە. ١٩٦٧. لل. ٣٦٢، ٣٦٩، ٣٧٠، ٣٧٨)، بەپێـــــی "شـەڕەفنامە" عەشـــــیرەتی چەمیشـــگەزەک لە کــۆنەوە (!) لە "چۆخــور سەعد" ژیانیــان بەسـەر بـردووە، ئەو نـاوچەیە بە ئەرمەنســتانی قافقـاز یـان نـاوچەی یەریڤـان دەگوترێ (پەتروشێڤسکی، ١٩٤٩، ل. ١٠١)، پاشـان هێنـدێک زانیـاری بـاس دەکـرێ کە مـایەی سەرسـوڕمانە: لە کـاتی دەســتەڵاتی شــا ســــــۆڵتان محەمەدی خودابەنـــــدەدا (١٥٧٨-١٥٨٧) "نەزەر بەگ"ی دومبولی و هێندێک لە میرانی قزلبـاش (!) سـەر بە هۆزەکـانی ڕۆملـو. ئەلبەیات، چەمیشـگەزەک و سـەعدلی وەردەگەڕێنەوە بەرەو "دەربـاری ئاســـمان ئاســـای عۆســـمانی" (شـەڕەفنامە. ١٩٦٧، ل. ٣٦٢)، هەوڵ دەدەیــن وڵامــی ئەو پرســـیارە بــدۆزینەوە کە شـەڕەفخانی بتلیســـی بۆچی سـەرۆکی عەشـیرەتی چەمیشــگەزەک، وەک میرانـی قزلبـاش ناو دەبات.

شـەڕەفخانی بتلیســـی، هــۆزی چەمیشـــگەزەک وەک بەشــێک لە کۆمەڵەی یەکگرتووی هۆزەکـانی ئێـران دەژمێـرێ (شـەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل. ٣٦٩)، لەو بارەدا نووسـەری "شـەڕەفنامە" ڕوونیدەکاتەوە کە تەنیا ٤ لەو ١٨ عەشــــیرەتە ئامــــاژە پێکراوانە "لە مێــــژووی دووروودرێــــژی ناوچەکانیانـدا بەپێـی یاسـا و ڕیسـای میراتگەرییە باوەکـان، کەسـانی نەجیــبزادە میرایەتییــان تێــدا کــردووە" (شـەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل. ٣٧٠). شـەڕەفخانی بتلیســـی ئامــاژە بە هــزری ئایینــی سـەقامگرتووی نێــو هۆزەکـانی چەمیشــگەزەک و پـازوکی دەکـات و نووسـەر پێـی وایە کە "بەپێی دابونەریت و هەلسوکەوتیان نـاکرێ لە زومـرەی مۆسـلمانانیان

دا بنێین" (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل. ٣٧٨), ئەو ئاماژەیەی شەرەفخان بە هەڵکەوت نییە. لە باس کردن سەبارەت بە عەشیرەتی پازوکی، شەرەفخان بەتایبەت جەخت دەکاتەوە کە "زۆربەی ئەو هۆز و خێڵانە باوەڕیان بە ئایینی باو نییە و بە کردەوە هیچ پێداگری دەمارگیرانە بەرامبەر بە کردارە یاساغەکان لە خۆ پێشان نادەن" (شەرەفنامە، ١٩٦٧، ل. ٣٧٥).

ئەوە بەشێک بوو لەو زانیاریانەی نووسەری "شەرەفنامە" سەبارەت بە کۆمەڵەی یەکگرتووی هۆزی چەمیشگەزەک بۆمان باس دەکات. تەواوی ئەو تێبینیانە (لە دەرەوەی بەشی تایبەت بە حاکمانی چەمیشگەزەک) پێویستیان بە شیکردنەوە و ئاشکراکردنی لایەنە شاراوەکانی هەیە. لە بیروباوەڕی ئایینییەوە دەستپێدەکەین و لەو بابەتەوە کە شەرەفخانی بتلیسی بەڕاشکاویی خۆی دەپارێزێ لە هەژماردنی هۆزی چەمیشگەزەک لە زومرەی باوەڕمەندان بە ئیسلام.

لەڕاستیدا، لە باکووری رۆژئاوای کوردستان ئایینزایەک باوەڕمەندانێکی فراوان پەیدا دەکات کە وەک فرقەیەک لە ئایینی شیعە دەناسرێن. پارسە شیعەکان پێیان دەڵین عەلی ئۆڵاهیی - "عەلی وەک خوا دەپەرەستن"، "عەلی خوایی" (پێتروشێڤسکی، ١٩٦٦، ل. ٣٠٧), م. ڤان برۆینسن پییان دەڵێ Alevis عەلەوی.

بەپێی م. ڤان برۆینسن لە ناوچە جیاوازەکانی باکووری رۆژئاوای کوردستان، رادەی باوەڕمەندیی بە ئایینی عەلەوی جیاوازە. لە دێرسم (چەمیشگەزەک) گەلێک باوەڕمەندانی سەرسەختی ئەو ئایینە دەژین و بە وتەی نووسەر، کە دەقاودەق بۆچوونی شەرەفخانی هەیە و پێی

وایە زۆر زەحمەتە بەگشـــتی ئەو کەســـانە بە مۆســـڵمان دابنێیـــن ( Bruinessen, 1992, p. 23, 109, 268; شەڕەفنامە، ١٩٦٧،ل.٣٧٨).

بەپێـی ڤ.پ. نیکیـتیین، ئەو کـوردانەی لە کۆێسـتانەکانی دێرسـم دەژیـن، سـەر بە ئایینێکـی نزیـک لە ئیزیـدین و هێنـدێک بە "توجیـک" [تاجیک] و هێدێکیش بە قزڵباش ناویان لێـدەبەن (نیکیـتیین، ١٩٥٦، ل. ٢٣٥).

ئی.پ. پێترۆشێڤسکی بە گشت پەیرەوانی ئەو ئایینە کە لە تورکیـا دەژیـن دەڵـێ قزڵبـاش،- بە هـۆی بەشـدار بوونیـان لە بـزوتنەوەی قزڵباشـەکان لە سـەدەکانی ١٥ و ١٦ و دژایەتیـی کارایـان بەرانبەر بە حکـوومەتە سـونییەکانی ئاق قۆینلـوو و ئیمپراتـووریی عۆسـمانی، بە قزڵباش دانراون.

تێـبێنیی ئی.پ. پێترۆشێڤسـکی یارمەتیمـان دەدا تـا تەواوی ئەو پرسـیارانە روون بکەینەوە. هەروەهـا ئەوەش ئاشـکرا دەبـێ بـۆچی "شـەڕەفنامە" سـەرۆکەکانی عەشـیرەتی چەمیشـگەزەک لە ریـزی میرانی قزڵباش ناو دەبـات. لەژێـر کـاردانەوەی ململانیە لەمێژینەکـانی عۆسـمانی-سەفەویی دایە کە کـوردانی "عەلـی ئۆڵاهـی" چەمیشـگەزەک (دێرسـم) وابەسـتە کـراون بە قزڵباشـەکان کە پێگەی سـەرەکی بنەمـاڵەی سـەفەوییەکان و ئاڵاهەڵگـری هێـزی شـەڕکەری شیعەگەری بوون.

لەژێر سایەی بۆچوونەکانی ئی.پ. پێترۆشێڤسکی دایە کە بنەمای لـۆژیکیی هەڵوێسـتە سیاسـییەکانی خـانەدانە حوکمڕانەکـانی چەمیشـگەزەک دەردەکەون، بەتـایبەتی لە سـەرەتای سـەدەی ١٦دا

کاتێک بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، ناوچە شاخاویی و چڕوپڕەکـانی چەمیشگەزەکیان رادەستی میری قزڵباش، نێردراوی شای سەفەوی، دەکەن. حکـوومەتی ئیمپراتـووری عۆسـمانی بەحەق ئەو هەنگـاوەی وەک لایەنگـری لە سەفەوییەکان هەڵسەنگاندووە. هەر راسـت بەو هۆیەوە بوو لە ساڵی ١٥١٤، میری چەمیشگەزەک دێتە "بەرەوپیریـی" و سوڵتان سەلیمی یەکەمیـش بە بـێ یەک و دوو و لە رۆژی دوواتـردا لەسـێدارەی دەدا، هەڵبەت نە بەهـۆی رووداوە کۆنەکـان، وەک شەڕەفخانی بتلیسی باسی دەکات (شەڕەفنامە. ١٩٦٧, ل. ٢٢٣).

ئەوە کۆمەڵێـک زانیـاری بـوو کە توانیمـان لە "شەڕەفنامە"دا کە سەرچاوەی سەرەکی مێژووی کوردسـتان پێکـدەهێنێ بیـدۆزینەوە. بە لێکگرێـدان و هەڵسەنگاندنی ئەو زانیـارییە مێژۆییە لاواز و سـنووردارانەی سەبارەت بە هـۆزی چەمیشـگەزەک و مێـژووی خانەدانی حوکمڕانی میرانی چەمیشگەزەک و هەروهـا ئەو بابەتـانەی دەربارەی هۆزی مەلکیشیی لەبەر دەست دایە، هەوڵدەدەین سیمای رێڕەوی مێژوویی کۆمەڵەی یەکگرتووی هۆزی چەمیشـگەزەک بەلانـی کەم وەک هێڵێکی پچڕپچڕیش بێ، پێشان بدەین.

ڤ.ف. مینۆرسـکی لە نێـوان کـۆمەڵەی یەکگرتـووی هۆزەکـانی مەلکیشـی و چەمیشـگەزەکەوە جیـاوازییەک نـابینێ. لەو بـارەوە پرسیاریشی نەورووژانـدوە: چەمیشـگەزەک، "هـۆزێکی مەزن،...کە لە لایەن ئاق قۆینلـوو کەوتە بەر هێـرش و راونـان، خـۆی خسـتە بەرەی مەترسیداری قەرە قۆینلوو" (E12, 1981, Vol.V, fasc.85-86, p. 457). شەڕەفخان بە گێـڕانەوەی رووداوەکـانی پەیوەسـت بە سـوڵتانەکانی

قەرە قۆینلـوو و ئاق قۆینلـوو بە درێژایـی تـا ناوەڕاسـتی سـەدەی ١٦، کـۆمەڵەی یەکگرتـووی هۆزەکـانی چەمیشـگەزەک بە مەلکیشـی نـاو دەبـات، بەڵام بـۆ ژینگەی نـاوخۆیی ئەو کـۆمەڵە یەکگرتـوویە دەیتـوانی ناوێکی دیکەش هەڵبگری، واتە : چەمیشـگەزەک بەپێی شـوێنی ژیـان و نیشـتەجێ بوونی.

ئەو بەشـەش لە عەشـیرەت کە بـۆ ئێـران راگوازران و چەنـد جـاریش روویداوە، بە چەمیشـگەزەک ناوبراون. بەشێک لە کۆمەڵەی یەکگرتووی هـۆزە کە ژمـارەیەکی بەرچـاو لە سـەرۆکەکانیشـان لەگەڵ بـوو، چەمیشـگەزەکیان جێهێشـت بەرەو ئێـران و پـاش پێـدانی قەڵا و نـاوچەیەک لەلایەن قزڵباشـەکان بە حـاجی رۆسـتەم بەگ، لەگەڵـی کەوتـن. ئەو بەشـەش کە لە نـاوچەی چەمیشـگەزەک مـانەوە، کەوتنە بەر سـەرکوتکاریی و لەسـێدارەدان. بەپێـی "شـەڕەفنامە"، "گەورە و بچـۆکی عەشـیرەت" داواکـاریی "حـاجی رۆسـتەم بەگ"یـان وەک فەرمـانی ئاسـمانی وەرگـرت و بەپەلە بەرەو عێراقـی فـارس و ئیسفەهان لەگەڵی کەوتن.

کۆمەڵەی یەکگرتـووی هـۆز بە لەدەسـتدانی سـەرۆک و کەوتنە ژێـر زەخت و ئازار، بەناچار دوچاری پەڕشـوبڵاویی دەبـێ. کـۆمەڵێکی دیکە لە ئەنـدامانی هـۆز سـەر لەنـوێ دەسـت بە کـۆچکردن دەکەن و بەرەو ئێران وەرێدەکەون. پاش جەنگی چالـدران کە بە شکسـتی هێزەکـانی شـا کۆتـایی پێهـات، حـاجی رۆسـتەم بەگ کە وەک سـەرۆکی کۆنفیدراسـیونی هـۆزی چەمیشـگەزەک دەناسـرا، بەپەلە ئاڕاسـتەی سیاسـیی خـۆی گـۆڕی و وەک لەسـەرەوە باسـمان کـرد، گەڕایەوە بـۆ

خزمەت کردن بە سوڵتان سەلیم و لەگەڵ پیاوماقوڵانی هۆز لەسێدارە درا. میرنشینی چەمیشگەزەک توانی سەرۆکایەتی بۆ پیر حۆسێن بەگ، کوڕی حاجی رۆستەم بەگ بگەڕێنێتەوە و بەپێی "شەرەفنامە"، لە ماوەی سەرۆکایەتییدا، دەسەڵاتێکی تەواوی هەبوو. بەڵام لە کۆتایی سەدەی ١٦، میرنشینی مەزن و بەهێزی چەمیشگەزەک کە ناوەکەی هاوشان و بێرهێنەری کوردستان بوو، کەوتە بەر فەرمانی سوڵتان بۆ بەخشینی مەرجدارانەی زەوی و زارەکانی لە نێو کوڕ و کوڕزاکانی پیر حۆسێن بەگدا. چەمیشگەزەک بۆ دوو "سنجاغ"[1] و ١٤ "زعامەت"[2] و "تیمار"[3] دابەشکرا بەو مەرجەی کە پاشەڕۆکی پیر حۆسێن بەگ لە داهاتوودا نابێ داواکاریی زیادتر بکەن و چاویان لە "پلە و پایەی دیکە لە حاکمانی دەسەڵاتداری، پارێزراو لە لایەن پەروەردگارەوە" هەبێ (شەرەفنامە، ١٩٦٧،، ل، ٢٢٦)، دەبێ ئەوەش بڵێین کە قەڵای چەمیشگەزەک، هەروەها گوند و ناوچەگەلی "شایانی خاوەنداریەتیی میران" دەکەوێتە ژێر رەکێفی شاهانە. خانەدانی میریش دەکەوێتە بەر شالاویی ململانی باڵە جیاوازەکان بۆ وەرگرتنی خاوەنداریەتیی "زعامەت"ەکان. کۆمەڵگای هۆزیش کە ماوەیەک پێشتر میرنشینێکی مەزن و بەتوانای پێکهێنابوو، ململانێکی هاوشێوە بەرۆکی دەگرێ. هۆز دۆچاری لەتوپەتبوون و پەرتەوازەیی

---

[1] [یەکەی ئیداریی عۆسمانی، بچۆکتر لە پارێزگا. ویکیپێدیا.]

[2] [یەکەی ئیداریی عۆسمانی کە داهاتی ساڵانەی ٢٠ تا ١٠٠ هەزار ئاقچە بوو. ویکیپێدیا.]

[3] [یەکەی ئیداریی عۆسمانی کە داهاتی ساڵانەی ٢٠ هەزار ئاقچە بوو. ویکیپێدیا.]

[ئاقچە: سکەی زێوی عۆسمانی. ویکیپێدیا.]

دەبـــێ و بەشێکیشــــی بـــۆ دەرەوی دێرســـــم (چەمیشـــگەزەک) کۆچدەکەن.

بەشـــێک لەو پەرتەوازانە، لە لۆرســـتان (نـــاوچەی پشـــتکووە) نیشـــتەجێ دەبـــن و شـــێخ محەمەد مەردۆخ لە پەرتـــووکی خۆیـــدا بە هۆزی مەلکیشـی (مەلیکشایی) ناویـان دەبـات (تاریـخ مـردوخ. ١٩٤٤، ج.١, ص. ١١٣), دوو بەشـــیتری چەمیشـــگەزەک بەرەو ناوچەکـــانی یەریڤان (چۆخور سەعد) و ئاقداش لە وەلایەتـی شـیرڤان کۆچ دەکەن. ئ.پ. پێترۆشێڤســـکی لە ژێـــر نـــاوی چەمیشـــگەزەک. ئامـــاژە بە هەردوویان دەکات (پێترۆشێڤسکی، ١٩٤٩، لل. ١٣٩،١٤١).

لە دەستپێکی دەستەڵاتداریی شا عەباسی یەکەمدا، عەشیرەتی چەمیشـــگەزەک سەر لەنـوێ دەبـۆژێتەوە. بە فەرمـانی شـــا، لکوپـۆ پەرشـوبڵاوەکەی کۆمەڵگـای هـۆزی چەمیشـگەزەک کۆدەکرێنەوە و بە تێکەڵکردنی گەلێک "کوردانی بنەچە جیاوازەوە" لە خەستییەکەی کەم دەکـــرێتەوە و وەک کۆنفدراســـیۆنێک لە خێلەکـــان بە نـــاوی هـــۆزی چەمیشـــگەزەک[١] بـــۆ پاسەوانی ســـنوورەکان لە هێرشـــی تورکـــان، ڕەوانەی خۆراسان دەکرێن.

هـــۆزی چەمیشـــگەزەک لە خۆراســـان جێگیـــر دەکرێـــن، بەڵام بەو ئەرکەی بۆیـــان دیـــاریکراوبوو، هەمیشەش پابەنـــد نـــابن. لە ســـاڵی ١٧٢٧دا، هـــۆزی چەمیشـــــگەزەک، لە سەرکوتکردنی تورکمانەکـــان پشـــتگیریی نـــادر شـــای ئەفشـــار نـــاکەن و لە شەڕەکانیدا بەشـــداری

---

[١] م. ڤان برۆینسن ئاماژە بە "Konglomerat"ێک لە کوردانی جیاوازە لەرووی بنەچەوە، دەکات (Bruinessen, 1978, p. 150).
[Kon-glo-me-ra̱t تێکەڵاوێک لە دەنگەکانی مۆسیقای جاز و ڕۆک و کلاسیکە. ویکیپێدیا.]

ناکەن. تەنـانەت "بەهانـدانی محەمەد حۆسـێن خـان، حـاکمی هـۆزی چەمیشـــگەزەک"، هــۆزی "قەرچۆرلــوو" لە نــادر هەڵــدەگەڕینەوە، لە ئاکامدا کوردان هێرشیش دەبەنە سەر ئیـبراهیم خـان، سەرداری نـادر شـا. لە هێرشـی دووەمدا، سـپای ئیـبراهیم خـان نـاتوانێ بەرەنگـاریی لەخــۆ بکــات و دۆچــاری شکســتێکی سەرشــۆڕانە دەبــێ. وەک لە "شەڕەفنامە"دا نووسراوە، هەزار پیاو لە هێزەکانی حکوومەتی "نادری جیهـانگیر" دەکـوژرێن. پاشــان نـادر شــا بۆخـۆی دەسـتبەکار دەبـێ و هێرش دەباتە سەر کوردان. ئەوانیـش بەردەوام دەبـن لەبەرخۆدان: "لە قەڵا و سەنگەرەکانیان هەتنەدەر و ئاگریـان لە مەیـدانی شەڕ بەردا" و تەنیــا کاتێــک دەســت هەڵــدەگرن کە بەشــێکی زۆریــان لە شەڕدا دەکــوژرێن. لەئاکامــدا هۆزەکــانی کــورد ناچــار دەبــن بە خــزمەت و ملکەچیبوونی حکوومەت. پیاومـاقوڵانی هـۆزیش وەک دیـل لەبەرامبەر ملکەچیــی هــۆز، دەگــوزرێنەوە بــۆ شــاری مەشــهەد. بەپێــی ڤ.ف. مینۆرسکی (E12, 1981, Vol. V. Fsc. 85-86, p. 461) هەردوو هۆزی چەمیشگەزەک و قەرچۆرلوو بۆ مەشهەد راپێچ دەکرێن.

بەپێــی م. ڤــان برۆینســـن، پاشــان کۆنفێدراســیۆنی هۆزەکــانی چەمیشــگەزک دوو پــارچە دەبــن و هەریەکیــان بە ئیلخــانی جیــاواز. نووسەر کە بە هەردوو بەش دەڵێ کۆنفێدراسیۆن، (برۆینســن، ١٩٩٢، ل، ١٣٤) تا سەدەی بیستەم لە ژیـانێکی سەقامگیردا دەژیـن. وادیـارە ئەو پارچەبوونە لەژێر کـارگەریی رووداوەکـانی سەدەی ١٨ و هەروەهـا رووداوەکانی کاتی حوکمڕانی نادر شادا بوویێت.

بەوشێوەیە کۆمەڵگـای عەشـیرەتیی چەمیشـگەزەک کە بنچـی لە

کوێستانە دوورکەوتووە و چڕوپڕەکانی دێرسم داکوتابوو بەزەبر و زۆر، پەلکێش دەکرێ و چارەنووسی مێژوویی خۆی لە ئەوپەڕیی پانتایی ڕۆژهەڵاتیی ئێران لە خۆراسان دەبینێتەوە. دێرسم، ئەو شوێنەی کە هۆزی چەمیشگەزەک لێی لەدایکبوو، هەتاکوو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەش توانا و هێزی سەربازیی خۆی تا ڕادەیەکی بەرچاو ڕادەگرێ. بەپێی ڤ.پ. نیکیتین (نیکیتیین، ١٩٥٦، ل. ٢٣٥)، لەو سەردەمەدا دێرسم توانای چەکدارکردنی ٣٠ تا ٤٠ هەزار کەسی هەبۆووە.

* * * * * *

تەنیا سەرکۆنەی شەڕەفخانی بتلیسیی لە هۆزە کوردەکان، ئەوەیە کە لەنێوان خۆیاندا یەکگرتوو نەبوون و گوێڕایەلی و فەرمانبەرییان لەیەکتر نەبووە. شەڕەفخان بەداخێکی گرانەوە دەڵێ: "هەر هۆزێک بەتەنیایی بۆ سەربەخۆیی حەولی داوە و یەکلایەنانە ئاڵای نافەرمانیی هەڵکردووە. ئەوان بە هۆی ژیانیان لە لۆتکەی چیاکان و **بەپێی سرووشتی خۆیان**، ئامادەی سەربەخۆیین. جگە لە پەروەردگار کە بۆیان تاقانەیە، هیچ بۆچۆنێکی یەکگرتوویان لەناودا نییە و یەک حاکمیش کە هەموو کوردان لەسەری هاوڕا بن، نییانە" (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل. ٨٥).

شەڕەفخان تەواوی پەڕتووکە بەنرخەکەی بۆ بیرۆکەی یەکگرتوویی کورد تەرخان کردووە. ئەگەر پەڕتووکەکەی بە کاشانەی کوردان ناوبەرین، شەڕەفخان گشت کوردانی، بە هۆزە پەرشوبڵاوەکانی، بە

زاراوە جیاوازەکانیانەوە، و بە ئەوانەش کە هەڵگری بیروبـاوەڕی ئایینــی باویی مۆسڵمانیەتیی نەبــوون (شـەڕەفنامە، ١٩٦٧،ل.ل. ١٧٥، ٣٢٧) - واتە باوەڕمەنـــدانی ئێزیدیســـم، لەژێـــر ســـێبەری ئەو کاشـــانەیە کۆکردووتەوە.

## عەبدولڕەزاق بەگی دومبولی (١٧٦٢/٦٣-١٨٢٧/٢٨)

دومبـولی [دنبلـی بە زمـانی فارسـی] نـاوی هـۆزێکی بەناوبـانگی کوردە. ناوی هـۆز، پێکهـاتن و سەهەڵدانی، پێوەنـدیی بە نـاوچەیەکی دیاربەکرەوە هەیە. هەر لەوێ قەڵایەک بەو ناوە هەبـووە و لەسـەرەتاوە ئەو هـۆزە لەوێ ژیـاوە. پاشـان (وەک شـەڕەفخانی بتلیسـیی ئامـاژەی پێدەکات) دومبولییەکان لە ناوچەی جزێر و ولایەتی بۆتان جێگیر دەبن و کوردەکان هێندێک جار ئەوانە بە دومبولی-بـۆهت (شـەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل. ٣٥٧) نـــاودەبەن. لە کۆتـــایی سـەدەی ١٦، واتە لە سـەردەمی شـەڕەفخاندا، دومبولییەکـــان بەرەو رۆژهەڵات کۆچ دەکەن. سلسـلە تورکمانەکـانی قەرە قۆینلـوو و ئاق قۆینلـوو چاولەدەسـتی هێـزی سـەربازیی ئەو هـۆزە بـوون، و لەبەرامبەری ئەو خزمەتە سـەربازییە، ناوچەی سـەلماس لە باشـووری رۆژئاوای شـاری خۆی لە ئازەربایجـانی ئێرانیان پێدراوە. لە سـەردەمی ئۆزۆن حەسـەنی ئاق قۆینلـوودا (١٤٥٣-١٤٧٨)، "بەڕێـوەبردن، بەرگـری و پشـتیوانیکردنی" نـاوچە و کـوردانی هەکارییـان پێـدراوە و کۆنـتڕۆلی تەواوی نـاوچەی هەکـاری دەکەوێتە

دەست دومبولییەکان.

هێزی سەربازیی روو لە هەڵکشاوی کۆمەڵەی یەکگرتووی هۆزی دومبولی یارمەتیدەری خانەدانی سەرۆکانی هۆز بوو بۆ وەدستهێنانی توانای پێویست و گەیشتن بە لوتکەی سیاسی بەڕیوەبردنی ناوچەکەیان کە لە سەردەمی حکوومەتی شا تەهماسب (١٥٧٦-١٥٢٤) بە ناوی "حکوومەتی خۆی و دومبولی" ناسراوە.

شا تەهماسب لەبەرامبەر مەترسیی روولەهەکشانی کاردانەوەی دومبولییەکان لە کوردستان (پێترۆشێڤسکی، ١٩٤٩، ل. ١٠٥) دەست بە کۆمەڵکوژیی بەربڵاویی هۆزی دومبولی دەکات. ئەندامانی خانەدانی حوکمڕان و ئەو دومبولییانەی لەو کۆمەڵکوژیانە رزگاریان دەبێ لە لای عۆسمانییەکان سەرپەنا دەدۆزنەوە و بەدڵێکی ئاواڵا پێشوازییان لێکراوە و لە "بەخشەندەیی بێسنووری پاشا" بەهرەمەند بوون. بەشێکی دیکەی رزگاربووکان دەکەونە بەر لێبردوویی شا تەهماسب.

چارەنووسی داهاتووی هۆزی دومبولی لە سنووری نێوان دوو ئیمپراتووریای دوژمنکاردا، دەکەوێتە دژوارییەکی زۆر، بەڵام لە نێوان ساڵانی ١٧٤٧-١٨٢٨دا کە پێترۆشێڤسکی بە سەردەمی نێوە سەربەخۆیی ١٦ خانشینی ئازەربایجان و ئەرمەنستانی قافقاز ناوزەد دەکات، خاننشینیی خۆی و دومبولی وەک یەکێک لەو خاننشینە نێوە سەربەخۆیانە ناو دەبات. لە تەواوی ئەو خاننشینانەدا "حاکم"ە بەمیراتگەیشتووەکان، واتە سەرۆکانی هۆزە کۆچەرەکان حکومەتیان

کردووە (پێترۆشێڤسکی. ١٩٤٩، ل. ٨٦).

لە ماڵبـــاتی خانەکـــانی خـــۆی و دومبـــولی "میرانـــی مەزن" و کەسایەتیی حوکمڕان سەریان هەڵداوە. خانەدانی سەرۆکانی هــۆزی دومبــولی کە لە نووســراوەکاندا بە کــۆچەر ناســراون[١]، ســەرداران و فەرمانـــدەگەلی سەربازیی زۆر بەناوبانگەیـــان لـــێ هەڵکەوتـــووە. مێژوونـووس و هەڵبەسـتوانی کـورد، عەبـدولڕەزاق بەگـی دومبـولی، نووسەری نزیــک بە ٢٠ پەڕتــووک، لەو خــانەدانەدا سەری هەڵــداوە. پەڕتووکی "مئاسر سۆڵتانییە"[٢] بەناوبانگ‌ترین بەرهەمی عەبــدولڕەزاق بەگی دومبولییە.

مـــاوەیەک لەمەوبەر لە ماتەنـــاداران [ناوەنـــدی دەستنووسەکانی کەونار] لە یەریڤان، دەستنووسێکی زۆر دەگمەنی عەبدولڕەزاق بەگی دومبــولی بەنــاوی "تــاریخی دەنــابیلی"، واتە مێــژووی دومبولییەکــان ئاشـــکراکرا کە تـــا ئێســـتا لەچـــاپ نەدراوە. لەو دەستنووسەدا بە دوورودرێژیی رووداوەکـانی سەدەی ١٧ و ١٨ باسـکراون و مێژوونـووس نەتەنیـــا لەسەر خــانەدانی حــوکمڕان، بەڵکــوو سەبارەت بە تەواوی کۆمەڵەی یەکگرتووی هـۆزی دومبـولی زانیـاریی زۆر گرینـگ و دەگمەن ئاشکرا دەکات.

نەجەف قـــوڵی خـــان، بـــاوکی نووسەر، یەکێـــک لە فەرمانـــدە پایەبەرزەکـانی نـادر شـای ئەفشـار، بەشـدار بـووە لە هەمـوو شەڕ و

---

[١] سەبارەت بە نـۆکتە وگاڵتەجـاری کە دەبـارەی دومبـولییە کۆچەرەکـان بـاو بـووە، تەنـانەت شەڕەفخانی بتلیسیش خۆی پێرانەگیراوە (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل.ل، ٣٥٨-٣٥٩).

[٢] ["مآثر سلطانییە" بە فارسی، سەبارەت بە دەستکەوتەکانی حکوومەتی فەتحعەلـی شـای قاجار تا ساڵی ١٢٤١ ە.ک.، هەمان ساڵ لە تەبرێز لەچاپ دراوە. ویکیپێدیا.]

لەشکەرکێشییەکانی نادر شا و وەک "بیگلەربەگ"ی تەبرێز خزمەتی کردووە (پاپازیان، ١٩٧٥، ل. ٢١٢; بامداد، ١٩٦٦، بەرگی ٢، ل. ٢٦٤).

بەسەرهاتی ژیانی عەبدولڕەزاق بەگی دومبولی جیاواز بووە. لەکاتی مێرمنداڵیدا بەفەرمانی کەریم خانی زەند (١٨٣٣-١٧٨٣ ) لە بەرامبەر وەفاداریی باوکی بۆ شا، ١٤ ساڵ وەک "دیل" لە دەرباری شا لە شیراز راگیراوە. لە ساڵی ١٧٨٤/٥ دا بە فەرمانی ئاغا محەمەد خانی قاجار ئازاد دەکرێ. عەبدولڕەزاق بەگ دەگەڕێتەوە تەبرێز و سەرقالی هەڵبەست و مێژوونووسین دەبێ. سرنجی عەباس میرزا ( ١٨٣٣-١٧٨٣)، جێگری پاشای ئێران بۆ لای خۆی رادەکێشی و لە بارەگای "وەلیعەهد"دا جێگیر دەبێ.

عەبدولڕەزاق بەگی دومبولی تەنیا مێژوونووسی هۆزی دومبولی نەبۆوە. ئا.د. پاپازیان لە ماتەنادارانی یەریڤان، دەستنووسێکی دیکەش ئاشکرا دەکات بەناوی "ئیشارات ئەلمەزاهیب" کە بەقەڵەمی رۆستەم خانی کوڕی ئەحمەد خانی دومبولی نووسراوە. ئەو پەڕتووکە لە شاری خۆی و لە ساڵی ١٨٤٩/٥٠ نووسراوە (پاپازیان، ١٩٧٥، ل. ٢١٤), لەو دەستنووسەدا، رۆستەم خانی دومبولی ئاماژە بە لکوپۆی هۆزی دومبولی لەسەرەتاکانی سەدەی ناوەڕاستەوە تا سەردەمی ژیانی خۆی دەکات[١].

---

[١] [بەشێک لە خانەدانی دومبولی لە سەردەمی شا عەباسی دووەم بەهۆی کێشە ناوخۆییەکنیان بەرەو شاری کاشان کۆچدەکەن. شا "ضرابخانە"ی کاشانیان پێدەدات و پاشتر پاشناوی "ضرابی" وەردەگرن. "محمد تقی بهار، ملک‌الشعرای نهار" و "ابوالحسن صبا" هەڵکەوتووی ئەو خانەدانن. تاریخ کاشان، کلانتر ضرابی]، سەرچاوە:

http://www.donboli.ir/index.php/meet-donboli-family/donboli-history

## مەلا مەحموود بایەزیدی (؟-١٧٩٧)

پاش شەرەفخان گەلێک مێژوونووسی دیکەی کورد هەوڵیان داوە کاری ئەو دیرۆکنووسە مەزنە کوردەی کۆتایی سەدەی ١٦ پەرە پێ بدەن، بەڵام هەموو ئەو هەوڵە ناسراو و لەبەردەستانە، جگە لە هێندێک درێژکراوەی بەشە جیاوازەکانی "شەرەفنامە" نیین. تەنیا کەسێکی کە پاش شەرفخان توانی بوێرانە خۆی لە نووسینی چارەنووسی مێژوویی گشت کوردستان بدا ئەویش نەک مێژووی هێندێک ناوچە و هۆز یان چەند خانەدانی حوکمڕان، مەلا مەحموودی بایەزیدی [بازیدیی] لەدایکبووی شاری بایەزید [بازید] بوو کە یارمەتێکی بێوێنەی داوە بە ئا.د. ژابا[١]، کۆنسولی رووسیەی لە

[١] [ئافگوست دێمێنتێویچ ژابا (یان August Kościesza-Żaba، ١٨٠١-١٨٩٤) دیپلۆماتکار و رۆژهەڵاتناسی رووس (پۆلۆنی) یەکێک لە دامەزرێنەرانی کوردناسی لە رووسیا و ئوروپا، لە ساڵی ١٨٤٨ دەبێتە کۆنسۆلی رووسیا لە ئەرزرووم و لەسەر داوای مۆزەخانەی ئاسیا لە سان پێترزبورگ (پاشان دەبێتە پەیمانگای دەستنووسە مێژوویەکانی رۆژهەڵات لە ئاکادێمیای زانستی رووسیا) فێری زمانی کوردی دەبێ. بەو هۆیەوە لەگەڵ مەلا مەحموودی بایەزیدی و ئەحمەدی خانی ئاشنا دەبێ. لە ساڵی ١٨٦٠ کۆمەڵێک کورتە چیرۆکی کوردی و "مەم و

ئەرزرووم بـۆ فێربـوونی زمـانی کـوردی و هەروەهـا کـۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی دەستنووسە کوردییەکان (پڕوانە مۆسائێلیان، ۱۹۹۱).

مەلا مەحمـوودی بایەزیـدی لەدایکبـووی سـاڵی ۱۷۹۷، پـاش تەواوکردنی خوێندن و لە سەردەمی لێکەوتنی دوایین میری کورد لە بایەزید، ئەو شـارە بەرەو ئەرزرووم جێدێڵێ. دیداری چارەنووسسـازی مەلا مەحمـوود لەگەڵ ئا.د. ژابـا لە سـاڵی ۱۸٥٦ و پـاش هـاتنی کۆنسول بۆ ئەرزرووم روویداوە، تا ئەو کـاتەش مەلا مەحمـوود تووشـی زۆر کوێرەوەریی دەبـێ: سـۆپای عۆسـمانی هەوڵـدەدا کەڵـک لە مەلا مەحمود وەربگرێ بۆ نێوانگیریی لەگەڵ میری راپەڕیوی کورد لە جزێـر. ئەگەرچی مەلا مەحموود لەو ئەرکەدا سەردەکەوێ و تەنـانەت بەدڵـی حکوومەتی تورک دەبـێ، بەڵام لەنێـوانگیریی راپەڕینـی نـوورالله بەگ، میـری هەکاریـدا، مەلا مەحمـوود دەکەوێتە بەر لـۆمە و رەخنەی دەستەڵاتدارانی تورک و بۆماوەیەکی کۆرت دەستبەسەر دەبێ.

وەک ئا.د. ژابـا دەنووسـێ، کاتێـک گەیشـتووتە ئەرزرووم، مەلا مەحمـوود لەوپەڕی نەداریـدا ژیـاوە و بیـری لەگەڕانەوە بـۆ کوردسـتان کردووە. نووسـەر بۆ فێربوونی زمانی کوردی داوای هاوکاری و یارمەتیی لە مەلا دەکـات و مەلا مەحمـوود واز لە گەڕانەوە دێنـێ و لەو کـاتەوە هاوکـاری دوورودرێـژ و زۆر بەپێـز و بەرهەمـی مەلا مەحمـوود و ژابـا

---

زیـن"ی ئەحمەدی خـانی بە زمـانی فەڕانسـی لەچـاپ دەدات. دەستووسـی فەرهەنگـی فەڕانسی-کوردی و فەرهەنگی کوردی-فەڕانسـی-رووسی ژابـا، ئێسـتا لەچـاپ نەدراون و لە ئاڕشیڤی ئاکادێمیای زانستەکانی رووسیا لە سان پێـترزبورگ راگیـراون. فەرهەنگـی کـوردی-فەڕانسـی ژابـا کە لە لایەن فێردینانـد یوسـتی (Ferdinand Justi) ئێراناسـی ئاڵمـانی زیـادترکراوە، چـاپ بـووە. لەو فەرهەنگەدا ئامـاژە بە سەرچاوەی وشەکان کـراوە و بە پیـتی عەڕەبی و دەربرینی (Transkriotion) لاتین نووسراوە. سەرچاوە: ویکیپێدیا، رووسی].

دەستپێدەکات. لەنێو ئەوکارانەی کە لەسەر مێژووی کورد پێکەوە دەیکەن دەبێ ئاماژە بە وەرگێڕانی بەرگی یەکەمی "شەڕەفنامە" بۆ یەکەمجار بە زمانی کوردی و بە دەست مەلا مەحمەوود بکەین (مەلا مەحمەوود بایەزیدی،١٩٨٦ ) هەروەها بەداخوازی ئا.د. ژابا، مەلا مەحمەوود دەستدەکات بە ئامادەکردنی دەستنووسێکی هەمەلایەنە لە هەزار لاپەڕەدا بەناوی "کتێبی تاریخی جەدیدی کوردستان"و خەڵاتێکی باشی پێشکەش دەکات. ئەو پەڕتووکە لە تاقە بەرگێک و لە ساڵی ١٨٥٧/٥٨دا نووسراوە.

ئەو نووسراوەی مەلا مەحمەوود، سەرنجێکی زۆری ئا.د. ژابا بۆلای خۆی رادەکێشێ و بیر لەوەرگێڕانی دەکات. ئا. د. ژابا لە ٣٠ مارسی ١٨٦٧، پێشەکی پەڕتووکەکەی مەلا مەحمەوود کە وەریگێڕابوو سەر زمانی فەڕانسی، دەنێرێ بۆ رۆژهەڵاتناسانی ئاکادێمیای زانستەکان لە پێترزبورگ تا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن. توانیومانە هەڵسەنگاندنێکی رەخنەگەرانەی "پ.ئی. لیرخ" [Peter Lerch] لەو نووسراوەیە کە بۆ بەشی مێژوو -زمانناسی "ئاکادێمیای زانستەکانی ئێمپراتۆریا" نێردراوە، لە ئاڕشیڤی ئاکادێمیای زانستەکانی رووسیادا بدۆزینەوە.

هەڵسەنگاندنە رەخنەگەرانەکەی "پ.ئی. لیرخ"، کوردناس و ئێرانناسی پایەبەرزی ئەوسەردەمە، زۆر کورت و بەرتەسکە. مخابن چارەنووسی ئەو پەڕتووکە مێژووییەی مەلا مەحمووود بایزیدی دیار نییە و تەنانەت لە نێو دەستنووسە کوردییەکانی کە ئا.د. ژابا خاوەنداری بۆوە و لە پەڕتووکخانەی میریی "م.ئ. سالتیکۆڤ-شێدرین" [لە سان

پێــترزبورگ] پــارێزراون، نەدۆزراوەتەوە. ئا.د. ژابــا لە نامەکــانی ســاڵی ١٨٧٦و ســاڵەکانی دوواتریشــدا هیــچ ئامــاژەیەکی بــۆ ئەو بەرهەمە نەکــردووە. لەو بەرهەمە گشــتگیرە مێــژووییەی مەلا مەحمــوودی بایزیدی، تەنیا پێشەکی دەستنووسە وەرگێردراوە فەڕانسییەکەی ئا.د. ژابا لە ئاڕشیفی ئاکادێمیای زانستەکانی رووسـیا لەبەر دەسـتدایە کە بریـتیی لە ٥٠ لاپەڕە بە قەوارەی ٢١،٥ لە ١٧ســانتی میـتر. هەروەهـا دەزانین کە ئەو پەڕتووکە مێژوویيە پێکهاتووە لە پێرست، خشتەی ناوی ئەو میــر و ئاغــا و حاکمــانەی کە لە ســاڵانی ١٢٠٠ تــا ١٧٨٥/٨٦دا دەستەڵاتدار بوون (بەپێی ناوەڕۆکی نامەی ئا.د. ژابا بــۆ ب.ئا.دۆرن[1] لــە رێکەوتــی ١٣ی جــوولای ١٨٦٧)، پێرســتی ئەو پەڕتــووکەش زۆر سرنجڕاکێشە، چۆنکــوو رێگامــان پێــدەدا تــا بەتەواویــی لە نــاوەڕۆکی تێبگەین.

کەوابــوو، ئێمــرو تەنیــا شــتێکی کە لەبەر دەســتماندایە بریــتییە لە پێشەکی ئەو پەڕتــووکە کە مەلا مەحمــوود بایەزیــدی ، خــوێنەرانی دەبــاتە نــاو نووســراوەکە و باســی کێشە هەمەلایەنەکانیــان بۆدەکات. کێشەکان گەلێکــن، ژینگەی کــورد ئالــۆز و لێــڵ و رەنگــاورەنگە، پــڕە لە ناتەبــایی و دژبەری و لەیەکەم نیگــادا زۆر دژوارە بــۆ لێکــدانەوە. لێــرە هەموو دیاردەکان چڕوپڕ لێــک گرێــدراون: کــۆچەریی، یەکجێنشــینیی، خێڵەکــان، ئایینە جیاوازەکــان و تێکەڵاویــی بــێ هەژمــاری کــۆمەڵە نەتەوەیی و رەگەزییە جیاوازەکان. جگەلەمە، لێکداپڕاویی سیاســیی و

---

[1] [Albrecht Bernhard Dorn ئاڵمــانی، مێژوونــووس، رۆژهەڵاتنــاس و زمــانەوانی زمــانە سامییەکان].

پارچەپـارچەبوونی وڵاتـی کـوردان، مـۆرکی خـۆی لەسـەر گشــت ئەو دیاردەگەلە داناوە.

مەلا مەحموود بایەزیدی لەو پێشەکییەدا زۆر لایەنی روونکردووتەوە. هەر لەو پێشـەکییەدا دەکرێ زانیاری زۆر دیـار سـەبارەت بە هۆزەکـان و بڵاوبوونەوەیـان[٢] لـە کوردســتاندا بەپێــێ زاراوەکانیــان کــۆبکەینەوە و هەروەها تێگەیشتنی مەلا مەحموود لەو دیاردانە بزانین.

مەلا مەحمــوود نەتەوەی خــۆی خۆشــدەوێ. شــانازی بە شــکۆ و کەونـاریی مێـژووی نەتەوەکەی، بە دلاوەری و بـوێریی و جەنگـاوەریی کوردان، بە کۆڵنەدان لە مەترسییەکان، بە ئامادەبونیان بۆ یارمەتیـدان و خۆبەختکردنیـــــان دەکـــــات، هەروەهـــــا بەسەربەرزییەوە ئامـــــاژە بەهەڵسوکەوت لەگەڵ ژن دەکات کە لە وڵاتـی کوردانـدا ژن دیلـی نـاو مـاڵ نییە. بەدڵنیـاییەوە دەبـێ بڵێیـن، مەلا مەحمـوود لەو پێشـەکییەدا تەنیـــا بە نەتەوەکەی هەڵنـــاڵێ و نووسـەر لە باســـکردنی لایەنە نەرێنییەکانی ژیانی راستەقینەی کوردان خۆی نەپاراســتووە. ئەگەر بە وردی ســرنجی گۆشـەنیگا رەخنەئامێزەکـانی بـدەین، مەلا مەحمـوود رەخنە و گازەندە لە کوردانی کۆچەر و هـۆزە کۆچەرەکـان دەگـرێ. مەلا مەحمـــوود بەپێچەوانەی هەڵوێســــتی سەبارەت بە بــــرا کـــوردە رەوەنـدەکان، پێیوایە کـوردانی نیشــتەجێ "خەڵکـانێکی رێکوپێـک و خاوەن دڵێکی پاک و جێگای رێز"ن (ڤاسـیلییەڤا، ١٩٩١، بەشــی III، ل.ل. ٥٦،٥٧، ٥٩-٦٢، ٧٢، ٨٠، ٨٤، ٨٦-٨٩، ٩٤، ٩٦، ٩٨، ٩٩).

---

[٢] پڕوانە بابەتی : ئ.ی. واسیلییەڤا، پەڕتووکێکی نەدۆزراوەی مێژووی کوردسـتان، لە گۆڤـاری "بەڵگەنـامە یادگارییەکـان و کێشەکانی مێـژووی کولتـوری گەلانـی رۆژهەڵات". بەرگـی ٢٤، بەشی ٣، چاپی لێنینگراد، ١٩٩١, ل.ل. ٦٤، ٦٧-٧٢، ٧٥، ٧٦ .

ئەو وتەی مەلا مەحموود سنوورێکی دیاری ژینگەی کورد لە نێوان کۆچبەریی و یەکجێنشینییمان بۆ ئاشکرا دەکات. لە ژیانی راستەقینەی ناوچەکەدا، ئاژەڵداریی کۆچەر و وەرزێریی نیشتەجێ، دوو بازنەی بەستراو و نەگۆڕی بەستێنی ئابووری کوردانی پێکنەهێنابوو. هاوپەیوەندیی و هاوکاری لە نێوان کۆچەریی و یەکجێنشینی تایبەتمەندی بەرچاوی ناوچەیەکی وەک کوردستانە. ناتەبایی لەنێوان کۆمەڵگاکانی کۆچبەریی و یەکجێنشینیی رۆانگەیەکی شارنشینەکان بووە و بۆیە مەلا مەحموود، نووسەری "کتێبی تاریخی جەدیدی کوردستان" وەک شارنشینێک، ئەو ناتەباییەی زۆر بەرجەستە کردووتەوە. ئەو دوو گرۆپە کۆمەڵایەتییە، بەیەکەوە پێکهێنەرانی یەک ستروکتور بوون و بە هیچ شێوەیەک نەگۆڕ و چەقبەستوو نەبوون و م. ڤان برۆینسن جەخت دەکاتەوە کە لە نێوانیاندا **هەمیشە** جوڵە و گۆڕانکاریی ئاراستەدار هەبووە [واتە کۆچەر بۆتە وەرزێر و بەپێچەوانە] و ئەو گۆڕانکارییە بەپێی کات و هەلومەرجی سیاسیی و ئابووریی روویداوە (Bruinessen, 1978, p. 144).

پێشەکی مەلا مەحموود گەلێک زانیاریی بەنرخ بۆ کردنەوەی گرێکوێرەی خشتەی ناوەکانی هۆزە یەکگرتووە هاوخوێنەکانی کوردی تێدایە. سەرەڕای پڕ بوون لە ناڕوونی و ئاڵۆزیی لەو خشتەیەدا، بە لێکۆڵینەوە لە "شەرەفنامە"، دەکرێ هێندێک یاسا و ریسا بۆ نموونە، لە بەکارهێنانی وشەگەلێکی وەک "تایفە"، "عەشیرە" و "قەبیلە" بدۆزینەوە (ڤاسیلییەڤا، ١٩٦٩)، کە مەلا مەحموود بەتەوایی

پەیرەویــــی لێکــــردووە (ڤاســــیلییەڤا، ١٩٩١، بەشـــی III، ل.ل. ٦٩،٧٠،٧٥،٧٩)، مەلا مەحموود هەر لەسەرەتاوە ئەو راستییەی لەبەر چـــاوگرتووە و "تـــایفە"ی بە مانـــای "ناوەنـــدی خـــانەوادە"، "لانکەی هـاوخوێنیی" بەکارهێنـاوە کە پاشـان دەبێتە پێکهێنەری "عەشـیرە" و "قەبیلە". بەڵام چ لە پێشەکییەکەی مەلا مەحمـــــــــــــوود و چ لە "شەرەفنامە"دا، زۆرجاریش ئەو سێ چەمکە بە مانـای تەواوی خۆیـان بەکـار نەهـاتوون و بەبـێ سـرنجدان بە ئاپۆرا و یـان تایبەتمەنییەکـانی دیکەیان، چەمکی "هۆز" بەکار هاتووە.

پێشـەکی پەڕتووکی "مێژووی نوێی کوردستان" رێگامان پێـدەدات تـا لە بیروبۆچـــوونی سیاســـی مەلا مەحمـــوود، لە هەڵسەنگاندنی بـــۆ هەلومەرجی سیاسـی کوردسـتان، بنەمـا و راسـتی و ئاسـۆکانی ئەو هەلـــومەرجە تێبگەیـــن. نووسەر کاتێـــک باســـی ناوچەکـــانی هـــۆزە کوردەکان دەکات زۆر ڕاشکاوانە ئامـاژە بە تایبەتمەنـدییەکانی دەکـات و وەک دیوارێکی زیندوو کە لە "گوشت و خوێن" پێکهاتووە، ناوی لێدەبات (ڤاسیلییەڤا، ١٩٩١، بەشـی III، ل. ٥٩)، و دەڵـێ ئەو هـۆزانە "وەک قەڵای مەیدانی شەڕ لە گورجستانەوە تا بەغدا، بەسـرە و شـارەزوور" لەپـاڵ یەکـتر جێگیرکـراون. لەڕاســتییدا ئەو دیـوارە وێنـاکردنی نـاوچە شـــاخاوییەکانی کوردســـتانە کە لەرووی هەڵکەوتـــووییەوە ناچـــار بـــۆتە ســـنوورێکی سرووشـــتیی لەنێـوان زلهێـزە دوژمنکارەکـان و گۆڕەپـانێکی هەمیشـەیی پێکدادان و جەنگەکانیانی پێکهێناوە.

مەلا مەحمـــوود هەر وەک شەرەفخانی بتلیســـــی، زۆر بەداخەوە باسـی دووبەرەکی، دوژمنکاری و ناکۆکیی نێوان هۆزە کوردەکان دەکـــا،

بەڵام مەلا مەحموود، کورد وەک یەک گەل بە یەک دابونەریتی تـایبەت بەخـۆ کە خـاوەن یەک زمـانە، پێناسـە دەکـات (ڤاســیلیەڤا، ١٩٩١، بەشـی III، ل.ل. ٥٩،٦٢), بۆ مەلا مەحمـوود باوەڕمەنـدیی بە ئایینـی ئیزدیی لەلای بەشێک لە کورد کە هێندێک جـار وەک شـەیتانپەرەسـت ناویـان لێـدەبەن، نـابێتە بنەمـای جیـاوازیی دانـانی ئەتنیکـی و وەک نووسـەر ئاماژەی پێدەکات، ئیزدییەکان مەگەر بە هۆی ئایینەوە، دەنا بە هیـچ شـێوەیەک لە کـوردانیتر جیانـاکرێنەوە. ئەگەر مەلا مەحمـوود بەهـۆی بـوونی وەک "مەلا"، هەڵگـر و پەرەپێـدەری بیروبـاوەڕی بـاویی ئیسـلام بزانیـن، ئەو جەختکـردنەوەی لە پەڕتـووکی مێـژووی نـوێی کوردسـتاندا، گەلێک سرنجڕاکێش دەبێ.

مەلا مەحموود ئەگەرچی خۆی پاراستووە لە جیـاکردنەوەی کـوردان بەهۆی بێروباوەڕی ئایینییەوە، بەڵام نەیتوانیوە دۆچاری ناوچەگەریی لە چوارچێوەی نـاوچەکەی خـۆی نەبـێ و لە پێشـەکییەکەیدا ئانـتی تێـزی "خـۆ – بێگـانە" بەرچـاو نـاکەوێت. مخـابن، مەلا مەحمـوود پێیـوایە هۆزەکانی مـوکری، بابـان، بلبـاس و زەرزا جیـاوازییەکی زۆریـان لەگەڵ دانیشتوانی باکووری کوردسـتان هەیە. هەروەها هەکـاری، بادینـانی و بۆتانییەکـان زۆر بە نەرێنیـی هەڵدەسـەنگێنێ (ڤاســیلیەڤا، بەشـی III، ل.ل. ٧٢،٩٨،٩٩) لەچـاو بـرا باکوورییەکانیـان کە نووسـەر پێیـوایە ئاکاری بەتواویی جیاوازیـان لەیەکـتر هەبـووە. لێرەدایە کە ئانـتی تێـزی "ئێمە – ئەوان" دەردەکەوێ، بەڵام ئەو جیاوازییە رەنگی ئەتنیکـی پێـوە دیــار نییە بەوجــورەی خوســرەو بــن محەمەد لە نووســراوەکەیدا کوردســتانییەکان تەنیــا بە کــوردانی نــاوچە مێــژووییەکەی ئەردەڵان

پێناسە دەکات (خوسرەو بن محەمەد، ١٩٨٤، ل. ٢٣)، وادیارە دووربوون و نەبوونی زانیاری راست و دروست لە ژیانی ناوچە پەرتەوازەکانی کوردستان، هێندێک بۆچوونی سەیری لای مەلا مەحموود دروست کردیێت. بۆ نموونە مەلا مەحموود جەخت لەوە دەکاتەوە کە هۆزە کۆچبەرکان لە ئێران بە "گوران" دەناسرێن (ڤاسیلیەڤا، ١٩٩١، بەشی III، ل. ٦٩).

سەرەڕای هەموو ئەو هزرە کورتبینانە و ناوچەگەرییانەی کە سەبارەت بە هەلومەرجی راستەقینەی کورد هەیبووە، مەلا مەحموودی بایەزیدیی یەکەم مێژوونووسی کوردستانە کە پرسی دەوڵەتی کوردی دەورووژێنێ. ئەگەر هزری یەکگرتوویی کورد لە بەرهەمەکەی شەڕەفخانی بتلیسیدا لەوبارەوە وەک سەرەکیترین بیروبۆچوونی شەڕەفخان هەڵچنین و لەلای ئەحمەدی خانی، هەڵبەستوانی کورد، ئەو هزرە وەک دڵسۆزییەکی خەمبارانە بۆ چارەنووسی گەلی کورد و ئاواتی یەکگرتنی ئەو گەلە لێکدەینەوە، مەلا مەحموود بەدڵنیاییەوە جەخت لەسەر یەکگرتوویی کورد و پێکهێنانی دەوڵەتی کورد دەکات. بەپێی بۆچوونی مەلا مەحموود، کوردستان بۆ پێکهێنانی دەوڵەت "ئاپۆرا و بنەماکانی پێویست"ی هەیە و "وەک نموونەی گەلانیتر" تەنیا پێویستی بە یەکگرتن هەیە (ڤاسیلیەڤا، ١٩٩١، بەشی III، ل،ل، ٨٩،٩٠).

بەپێی وتەکانی مەلا مەحموود دەردەکەوێ کە نووسەر لەسەر داوای حکومەتی تورک لە دانوستانەکانی نێوان میرانی کوردی راپەڕیو و حکومەت، بەشدار دەبێ و بەتەوایی لایەنگریی لە راپەڕیوەکان

دەکات و هەر بەو هۆیەوە دەکەوێتە بەر تووڕەیی و فشـاری حکـومەت و تەنانەت دەستبەسەریش دەکرێ.

لە کۆتاییدا پێویستە بڵێین، کاتێک تەنیا لە پێشەکییەکەی پەڕتووکی مەلا مەحمـوود بایەزیـدیی ئەو هەمـوو زانیـارییە بەنرخـانە دەبینیـن، بەدڵنیاییەوە دەبێ خۆدی کتێبەکە چەندها زانیاری سەبارەت بە کورد و هۆزەکـانی لەخۆگرتـبێت، بـۆیە هیـوادارم ئەو بەرهەمە مێژووییە بـدۆزرێتەوە. پێویسـتە بـۆ هەمـوو کـوردان لەنـاو کـتێبە کۆنەکـان و ئەرشیڤەکانیاندا زۆر بە وردیی لەدوای ئەو بەرهەمەدا بگەڕێن.

# قوتابخانەی مێژوونووسیی ئەردەڵان
# (کۆتایی سەدەی ١٨ تا سەدەی ١٩)

ناوی نووسەران، مێژوونووسان و هەڵبەستوانانی فەرامۆشکراوی کورد یەک لەدوای یەک ئاشکرا دەبن. ئەو ژمارە مێژوونوسە کوردانەی کە تا ئێستا لەبەر دەست دان و لە ناوچەی ئەردەڵان لە باشووری رۆژهەڵاتی کوردستاندا ژیان و تێکۆشانیان هەبووە، رێگامان پێدەدات تا باسی بوونی قوتابخانەیەکی کامڵی مێژوونووسیی ناوچەیی بکەین. هەر لەسەرتاوە بلێین، بۆ کوردستان هەبوونی گەلێک مێژوونووسی ناوچەیی دیاردەیەکی بێوێنەیە کە دەستەڵاتی میرنشینی خانەدانی بەنی ئەردەڵان هەلێکی زەنگینی بۆ رەخساندن (ڤاسیلیەڤا، ١٩٩١،ل. ٥) تا لێکۆڵینەوە بکەن لە رابردووی مێژووی باشووری رۆژهەڵاتی کوردستان کە زۆر نووسەر بە لانکەی کولتووری کورد، ناویان بردووە.

## محەمەد شەریف قازی [قازی محمەد شەریف]
## (سەدەی ١٨ تا سەرەتای سەدەی ١٩)

یەکێک لە ناسراو و کۆنترین نووسراوە مێژوویەکانی ئەردەڵان، پەرتووکێکی شەریف قازی‌یە کە لە ١٨٠٠/٠١ نووسراوە و تەنیا یەک نموونەی ئەو دەستنووسە لە کتێبخانەکانی جیهاندا دەست دەکەوێت و تا ئێستا لەچاپ نەدراوە[١]. دەقی ئەو پەرتووکە ئاماژە بە "مێژووی گشتیی" دەکات و تەنیا بەشی شەشەمی بۆ ئەردەڵان تەرخان کراوە و "ئ. براون" کە کاری پێرست نووسینی ئەو پەرتووکەی بۆ پەرتووکخانەی زانکۆی کێمبریج ئەنجامداوە،بە گرنگترین بەشی ئەو دەستنووسە هەڵیسەنگاندووە (Browne, 1932, p.104). ئەو بەشە

---

١ [ساڵی ٢٠١٤ کتێبێک بەناوی "تاریخ کردهای اردلان" لە ٢٢٤ لاپەڕە و لە لایەن وەشانخانەی "کردستان" چاپکراوە بە پێشەکی و پێداچوونەوەی "سیامند خلیلی" کە ئاماژە بە "محمد شریف قاضی اردلان"وەک نووسەر و "بە انضمام مستورە اردلان" کراوە. لە ناساندنی کتێبەکە کە لەلایەن ماڵپەڕی فرۆشی کتێبی "ایران فرهنگ" بڵاوکراوەتەوە دەڵێ، دەستنووسی ئەو کتێبە لە "کتابخانە ملی ایران" لەبەر دەستدایە و پێشەکی، خاڵبەندی، دابەشکردن و پێرستی نییە. و هیچ ئاماژەیەک بە "زبدە التواریخ سنندجی" نەکراوە.]
http://www.iranfarhang.com/BooksByGenerator.aspx?Generator=9321#;BID=15137

یەک لەسەر پێنجی پەڕتووکی "زبدە التواریخ سنندجی" پێکهێناوە.

محە مەد شەریف قــازی جەخـــتێکی تـــایبەتی لەسەر هۆزەکـــان نەکـردووە، بەڵکـوو "مێژوویەکـی گشـتیی" نووسـیووە و هەر یەک لە هۆزەکـــانی نـــاوچەکە بەشــــداریی کـــارا لەو مێـــژوویەدا دەکەن. لەو دەستنووسەدا زانیاریمـان سەبارەت بە هـۆزی گـۆران لە نێوەڕاسـتی سەدەی ١٧ دەست دەکەوێت. بەپێی محەمەد شەریف قـازی، کەلـب عەلی خان، میـری ئەڕدەڵان، "سەفی خـان سـۆڵتان"ی گـۆرانی وەک حــاکمی جـوانڕوو و سەرۆکی هـۆزی جـاف دەســـت نیشـــانکردووە. هیچکام لە مێژوونووسانی ئەڕدەڵان ئاماژەیـان بە چارەنووسـی هـۆزی جاف و پێوەنـدییەکانی لەگەڵ میرنشـینانی خـانەدانی بەنـی ئەڕدەڵان لە نێوان سەدەکانی ١٢ تا ١٧دا نەکردووە.

محەمەد شەریف قــازی، هەروەهــا لەبــارەی هــۆزی کەڵهــوڕیش ئاماژەی بە گەلێک زانیـاریی بەنرخـی کـردووە. ئەو زانیارییـانە سەدەی ١٧ دەگرێتەوە و بەبۆنەی مرید بـوونی میـری ئەڕدەڵان لەلای سـۆڵتان وەیسـی کەڵهوڕ نووسراوە و دەبێتە "حاکمی رەهای پالەنگان".

هەروەها زانیاریی سەبارەت بە هۆزەکانی گـۆران و کەڵهـوڕ لەنێـوان سەدەکانی ١٧ و ١٩ زۆر سرنجڕاکێشن. زۆربەی ئاپۆرای ئەو دوو هـۆزە لە پانتایی کرمانشاندا جێگیـر بـوون. ئەو دەستنووسە پـڕە لە زانیـاریی دەربارەی هۆزەکانی کورد.

پەڕتـــــووکی محەمەد شەریف قـــــازی یەکێـــــک لە سەرچاوە سەرەکییەکانی مێژوونووســـیی سلســـلەی میرنشـــینی ئەڕدەڵان

پێکدێنێت. ئەو بەشەی بۆ میرانی ئەڕدەڵان تەرخـانکراوە، دەکـرێ وەک یەکەم نەریـتی تـا ئێسـتا لەبەردەسـت و دۆزراوە لە مێژوونووسـیی خۆجێیی ناوزەد بکەین.

## خوسرەو بن مۆحەمەد بەنی ئەردەڵان،

### بەنازناویی جەواهیریی (لەدایکبووی ساڵانی ٨٠/٧٠ی سەدەی ١٨)

پەڕتووکە مێژووییەکەی خوسرەو بن محەمەد [لب التواریـخ] (پڕوانە: تاریـخ اردلان، مـاە صـفر ٣٥٣٦، خوسـرەو بـن محمەد بەنـی ئەردەڵان، ١٩٨٤) لە سـاڵانی ١٨٣٣-١٨٣٥ نووسـراوە، واتە لەسەردەمی دەستپێکی لاوازبوونی حکـومەتی خـانەدانی بەنـی ئەڕدەڵان و کەوتنە ژێر کاریگەریی بەهێزی دەسـتەڵاتی ئێران. نووسـەر لە ماڵبـاتێکی سـەر بە لکوپۆکـانی خـانەدانی بەنـی ئەڕدەڵان هەڵکەوتـووە و لە نەداریـدا ژیـاوە. وەک لە دەستنووسـەکەیدا ئامـاژەی پێکـردووە، "هەمـوو شـتێک درابوو بە بێگانە بەوانەی کە بە فارسـی دەئاخـافتن". واتە "میـر کەمـتر لەهەمـوو کەس بە ژیـان و گـوزەرانی خـزم و کەسـی خـۆی رادەگەیشـت"، بـۆیە "... زۆربەی ماڵبـاتی بەنـی ئەڕدەڵان لەوپەڕی نەداریی و بێدەرەتانی"دا دەدژیان (خوسـرەو محەمەد بەنـی ئەڕدەڵان، ١٩٨٤، ل.ل. ١٠٣ب، ١٠٧ب).

پـاش ئەو تێبینیـانە، ئاڕاسـتەی سەرەکی دەستنووسـەکە دەسـتپێدەکات و باسـی پلەوپـایەی بەرزی خـانەدانی بەنـی ئەڕدەڵان

دەکــات، رەسـەنایەتیی، شایســـتەیی و شـــکۆ و توانـــای ئەو ماڵبـــاتە پێشـــان دەدات. نووسـەر ئامــاژە دەکــا بە هەســتی نیشــتمانپەروەری دانیشتوانی ناوچەی ئەڕدەڵان و ئاواتی خۆپاراســتن و دوورکەوتنەوە لە "بێگانەکان" دەخوازێ.

خوسرەو بـن مـۆحەمەد وشـە بەوشـەی زانیارییەکـانی شـەڕەفخانی بتلیســی سـەبارەت بە خـاکی کوردســتان دووپاتـدەکاتەوە، بەڵام تەنیـا پانتــایی میرنشــــینی ئەردەڵان بە کوردســـتان نـــاو دەبـــات. بە نـــاوی ئەڕدەڵانیش تەنیا دوو جار ئاماژە دەکات (خوسرەو بـن محەمەد بەنـی ئەڕدەڵان، ١٩٨٤، ل. ١٠٠ئا). هەروەهـــا کاتێـــک باســـــی شـەڕە یەک لەدوای یەکەکـانی حاکمـانی ئەڕدەڵان لەگەڵ بابانەکـان، جافەکـان، زەنگەنە و هۆزەکانیتری کورد دەکات، تەنیا "شـۆڕەسوارانی" ئەڕدەڵان بە کورد نـاو دەبـات. نووسـەر تەنـانەت جـارێکیش بابانەکـان، جافەکـان، هەورامییەکان، زەنگەنە، موکرییەکان و ئەوانیتر بە کورد نـاو نابـات. لە یەکێک لە لاپەڕەکانی پەرتووکەکەیـدا، بابانەکـان کە نەیـاری حاکمـانی ئەڕدەڵان بـوون بە "بێگـانە" نـاو دەبـات (خوســـرەو بـن محمەد بەنـی ئەڕدەڵان، ١٩٨٤، ل. ٥٣ ب).

کەوابوو زۆر روون و ئاشـکرایە کە خوسـرەو بـن محمەد پێـش هەمـوو شـتێک ئەڕدەڵانییەکانی بە کورد و تەنیا ناوچەی میرنشـینی ئەڕدەڵانی بە کوردســـتان زانێــوە. ئەو راســـتییە هــزرەی سیاســـیی و مێژوویـــی قەدیـــس مـــانەوە لەچوارچێـــوەی نـــاوچەی خـــۆیەتی و نـــاوچەگەریی پێشـــاندەدات. رادەی ئەو نـــاچەگەرییە بەتـــایبەت بە هەڵسەنگاندنی بیرۆبۆچـــوونی خوســـرەو بـــن محمەد لەگەڵ جیهـــانبینی شـەڕەفخانی

بتلیســـی دەردەکەوێــت، کاتێــک شەڕەفخان دڵســـۆزانە باســـی چارەنووســـی گشــت گەڵــی کــوردی دەکــات و ئاواتەخۆازە بەهەر شـێوەیەک بـێ، یەک دەوڵەت بە سەرۆکایەتی پاشـایەکی بەهێـز بـۆ کورد دامەزرێ (شەڕەفنامە، ١٩٧٦، ل. ٢٩).

خوسرەو بن محەمەدیـش هەر وەک شەڕەفخانی بتلیسـیی، کـورد بەگـۆێرەی دابـونەریت و زمـانەوە بە چـوار لـک دابەش دەکـات. بەڵام خوســـرەو بـــن محمەد بە پێچەوانەی شەڕەفخانەوە، هــۆزی بەنـــی ئەڕدەڵان لە شـــوێن هــۆزی کەڵهــوڕ لە پلەی یەکەمــدا ناودەبـــات، لەکاتێکـدا حوکمڕانـانی خـانەدانی بەنـی ئەڕدەڵان هەرگێـز رووبەڕووی شەڕ و پێکدادان لەگەڵ هۆزی کەڵهوڕ نەبوونەوە. ئەو بەرزکـردنەوەیەی پلەوپـایەی بەنـی ئەڕدەڵانەکـان لەنێـو هـۆزە سـەرەکییەکانی کـورددا، هەمــان هــزری خــۆ بەزلزانیــن و خۆبــایی ماڵبــاتی و عەشـــیرەتی، پێشـاندەدات.

خوســرەو بــن محمەدیــش وەک شەڕەفخانی بتلیســیی پرســی باوەڕمەنــدیی ئایینیــی هــۆزە کوردەکــان لە ولایەتــی کوردســـتان دەوروژێنــێ و بە تــووک و نفـرەتەوە هەڵـدەکوتێتە سـەر ئەو کـوردانەی باوەڕیان بە ئایینی ئێزدیـی هەیە و بە شـەیتانپەرەسـت ناویـان دەبـات. ئەو هەڵچوونە لەڕادە بەدەرەی خوسرەو بن محمەد زۆر ناتەبایە لەگەڵ هەڵســـــوکەوتی ئارام و لەسەرەخۆیانەی شەڕەفخانی بتلیســــیی لەوبـارەوە. بەپێـی شەڕەفنامە، تەواوی تـاوانی ئێزدییەکـان بریـتییە لە رۆژوو نەگرتن و دۆعـا نەکـردن [نـوێژنەکردن]، چۆنکـوو بەهەڵە پییـانوایە پێشەوای مەزنیـان، "شـێخ ئادی" ئەو ئەرکەی خسـتۆتە سـەرشـانی

خـۆی و بـۆیە "... لە رۆژی دادگـا ترسـناکەکەدا، بەبـێ لێپرسـینەوە رەوانەی بەهەشت دەکرێن" (شەڕەفنامە، ١٩٦٧، ل.ل. ٨٣، ٨٤).

ئەو کۆمەڵگا عەشیرەتییانەی کە دەکرێ لە پەڕتووکەکەی خوسـرەو بن محەمەد لەبارەیاندا زانیاری بەدەست بێنین، بریتین لە پێنـج هـۆزی مەزنی: جاف،بلباس،هەورامی،، کەڵهوڕ و گـۆران. یەکەم ئامـاژە کە لە مێژوونووسـیی ئەردەڵانـدا سەبارەت بە هـۆزی جـاف کرابێـت، لە پەڕتـووکەکەی خوسـرەو بـن محەمەد دا دەبینینەوە (خوسـرەو بـن محەمەد، ١٩٨٤، ل. ١٢٤)، ئەویـش لەپێوەنـدیی دایە لەگەڵ دەستنیشانکردنی یەکێک لە سەرۆک جافەکان بـۆ حـوکمڕانی جـاف و جوانڕوو، "با ئیتر واز لە یاخییگەریی بێنن و گوێڕایەڵ و فەرمـانبەری شـا سەفی بن". وادیارە ئەڕدەڵانەکان گوێڕایەڵ و فەرمانبەریی جافەکانیـان بەدەست نەهێنـاوە و دوژمنـایەتی و پێکـدادانی نێوانیـان بەکـۆچکردنی بەشێک لە هۆزی جاف بۆ رۆژئاوا [گەرمیان]، کۆتایی پێهاتووە.

ئامـاژە و زانیارییەکـان سەبارەت بە کـات و هۆکارەکـانی کـۆچکردنی جافەکان یەکتر ناگرنەوە (ڤاسـیلیەڤا، ١٩٩١،ل.ل. ١٦٣-١٦٥)، بەڵام لە نـاوەڕۆکی ئەو بـابەتەی پەرتـووکەکەی خوسـرەو بـن محمەد دا، وەڵامی ئەو دوو پرسە بەروونی و بەوردیـی دەردەکەوێ. لێـرەدا ئامـاژە بە سەردەمی حـوکمڕانیی شـا سەفی (I) کـراوە، شـا سەفیش لە ساڵانی ١٦٢٩-١٦٤٢ لەسەر دەستەڵات بۆوە و وادیارە کە هۆزی جاف رێک لەو ساڵانەشدا دەستی بە ڕاپەڕین و شەڕ و کۆچی (بەشـێکیان) بەرەو رۆژئاوا [گەرمیان] کردبێت.

سەرپێچی هۆزەکانی هەورامان لە حکومەتی میرانی ئەردەڵان لەوەی جافەکان کەمتر نەبووە. حوکمڕانانی ئەردەڵانیش گەلێکجار بۆ گۆڕایەڵکردنی سوڵتانەکانی هەورامان هەوڵیانداوە کە خوسرەو بن محەمەد بە " کوێستان زادە یاخییەکان" ناویان دەبات و هەروەها پێیان دەڵێ "سەریان لە پەستەکی نافەرمانی" زۆرتر بەرزکردووتەوە و "ڕێگای دوژمنایەتییان" هەڵبژاردووە و "دەرگای فەرمانبەریی و پەیرەویی کردنیان داخستووە" (خوسرەو بن محەمەد بەنی ئەردەڵان، ١٩٨٤، ل.١٠٤ب).

لێرەدا پێویستە بڵێین، لە ساڵی ١٨٦٧/٨دا و پاش رووخانی میرنشینی ئەردەڵان، هەمان ئەو سوڵتانانی هەورامان کە بەو شێوەیە کەوتوونەتە بەر پلاری تورەیی و هەڵچوونی نووسەر، بەرگرییەکی سەرسەختانە لەبەرامبەر فەرهاد میرزا، شازادەی قاجار دەکەن کە بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەی ئەردەڵان دەستنیشان کرابوو.

یەکێتی هۆزەکانی هەورامان کە لە ناوچە سنوورییەکان میرنشینی ئەردەڵان نیشتەجێ بوون، کەمتر لە جافەکان بەرخۆدان و ڕاپەڕینیان نەکردووە. لە پەڕتووکەکەی خوسرەو بن محەمەد ئاماژە بە شەڕی سۆپای میر لە سەرەتای سالآنی ٣٠ی سەدەی ١٩دا، لەگەڵ راپەڕاوە هەورامییەکان کراوە. بەدرێژایی شەڕ و کاتێک "قارەمانانی سۆپای والی، هێرشیان بردە سەر هەورامییەکان و شەڕێکی دەستەویەخە لەنێوانیاندا روویدا" دیسان هەورامییەکان دەکەونە بەر "بەزەیی و لێبردوویی کۆتانەهاتوو" و نووسەر لە کۆتاییدا دەڵێ، "ئێستاش محەمەد سوڵتان هەورامی کە کەسی بەهاوشانی خۆی

نەدەزانـی، کەوتـووتە بەر لێـبردوویی ئەو (میـری ئەڕدەڵان)" (خوسـرەو بـن محەمەد بەنـی ئەڕدەڵان، ١٩٨٤، ل. ١٨٣)، هۆزەکـانی هەورامـی سـەرەڕای گـۆێڕایەلە نەبوونیـان، وادیـارە بەحەزەوە لە سـۆپای میـر خزمەتیـان کـردووە، تەنـانەت پاراسـتنی دیوەخـانی میـر لە سـنە وەک مافێکی تایبەت، بە تفنگچییە هەورامییەکان سپێردرابوو (Rich, 1836, Vol. I, p. 202).

لێـرەدا پێویسـتە بڵێیـن، خوسـرەو بـن محەمەد کاتێـک رووداوەکـان دەگێـڕێتەوە، بەڕەخنەوە نافەرمـانی و بەرخۆدانی هەورامییەکـان هەڵدەسەنگێنێ و زۆر بەخۆبـایی و خـۆبەزلزانین باسـی سەرۆکی هەورامییەکـان، محەمەد سـۆڵتان کە "کەسـی بە هاوشـانی خـۆی نەدەزانی"، دەکات.

خـانەدانی میرنشـینی بەنـی ئەڕدەڵان هەروەهـا لەگەڵ هـۆزێکی بەتوانای دیکەی کورد هاووشۆیان هەبـووە، بێگۆمـان ئەو هاموشـوویە لە گۆرەپـانی شـەڕ و پێکـداداان بـووە. لێـرەدا مەبەسـت هـۆزی بلباسـە. ئاڕاسـتەی کۆچکردنی هۆزی بلبـاس لە کـاتی جیـاوازدا تـا ناوچەکـانی بـاکووری ئازەربایجـانی تەنیـوەتەوە. ئەگەرچـی نـاوچەی سـەرەکی نیشـتەجێ بوونیان بەگشـتی باشـووری گـۆلی ورمـێ لە نێـوان شـنۆ و سـابڵاخ و هەروەهـا بەشـێک لە ناوچەکـانی بـاکووری حـوکمڕانی بابانەکان بۆوە. بەڵام زۆر جـاریش دەسـتدرێژیی بێباکـانەی ناوچەکـانی ئەڕدەڵانیشـان کـردووە و هیـچ بەهایەکیـان بەحـاکمە ناوچەییەکـان نەداوە.

کاتێک چاوەخشێنین بە نووسراوە مێژووییەکانی ئەڕدەڵان سەبارەت بە شەڕ و پێکدادان لەگەڵ بلباسییەکان، بۆمان دەردەکەوێ کە تێکهەڵچوون و کێبەرکێیەک لە هێز و چالاکی سەربازی لەنێوانیاندا هەمیشە بەردەوامیی هەبووە و هەریەک لە حاکمانی ماڵباتی بەنی ئەڕدەڵان بە ئەرکی خۆیان زانیوە کە لەگەڵ بلباسەکان دەبێ بە زمانی هێز بدوێن و تەنیا بە خۆ تەیارکردن و هێرش کردنە سەریان، ئاشتی لەنێوانیاندا بەرقەرار دەبێ. مێژوونووسانی ئەڕدەڵان بە ناوونــاتۆرەی گەلێک ناحەز باسی بلباسەکانیان کردووە، بەتایبەت خوسرەو بن محەمەد زۆر بەئاسایی بە تاقمێکی خۆفرۆشی بێدینی چەپەڵ، ناویان لێ دەبات.

هۆزی بلباس لە سازوکارێکی سیاسی-کۆمەڵایەتی خۆدمۆختاردا ژیاوە و بەتەواویی لەدەرەوەی کەین و بەینە دەرەکییەکاندا هەڵسوکەوتیان کردووە. بلباسەکان نە وابەستە بوون بە ئێران و عۆسمانی و نە ملکەچی ئەردەڵانەکان و بابانەکانیش بوون و بەدرێژایی سنووری نێوان هەموویاندا کۆێستان و گەرمێنی خۆیان کردووە. هەر بەهۆی ئەو نافەرمانی و ملکەچ نەبوونەیە کە بلباسەکان نەدەبا چاوەڕوانی هەڵسوکەوت و "پێهەڵکوتنی"تریان لە خوسرەو بن محەمەد کردبا.

مخابن هەر ئەو – بە وتەی خوسرەو بن محەمەد "تاقمە تاڵانچییانە"، بەپێی یاساکانی کۆمەڵگای عەشیرەتی بلباسەکان ببوون بە پشتیبان و سەرپەنا بۆ ئەو کەسانەی لەدەست ستمکاران رایان دەکرد و پێویستییان بەیارمەتی دەبوو. هۆزی بلباس پشتگیریی

سەربازیی هەموو شۆڕشگێر و نەیارانی دەستەڵاتی دەکرد و تەنانەت ببوو بە پەناگا و جێگای ئۆمێدی ئەندامانی خانەدانە حوکمرانەکانی لەدەستەڵات لابراویش. حاکمی بانە کە لە سەرەتای ساڵانی ٩٠ی سەدەی ١٨ ڕێبەریی شۆڕشێکی لە ناوچەکانی بانە، هەورامان و مەریوانی بەدەستگرت، لەلای بلباسەکان سەرپەنای دۆزییەوە (ماەشەڕەف خانمی کوردستانی، ١٩٠٠، ل.١٥٠)، لیستی ئەو کەسانەی لە لایەن بلباسەکانەوە یارمەتی و پشتیوانی کراون دەکرێ درێژ بکرێتەوە. بەهەموو پێوەرەکان و لەهەموو بارێکەوە، دەکرێ هۆزی بلباس وەک هۆزێکی رەسەن (کلاسیک) ناو بەرین. ئەو هۆزە نەتەنیا ئەرکی پشتیوانیکردن لە لێقەوماوانی وەک ئەرکێکی پیرۆزی عەشیرەتی بەجێ دەگەیاند، بەڵکوو هەڵگر و خاوەن بنەمایەکی نەگۆڕ بووە، واتە هۆزی بلباس "وەجاغ"ی [لانکەی] سەرۆکانی هۆز، پیاوماقووڵانی خانەدانی حوکمڕان بووە، وەک پێی دەڵێن "وەجاغی کاخدرێ".

## ماه شەڕەف خانمی کوردستانی [مەستورە]
## (١٨٠٥-١٨٤٧)

دەستنووسە مێــژووییەکەی مــاە شەڕەف خــانمی کوردســـتانی شوێنێکی تایبەتی لە مێژوونووسیی ئەڕدەڵاندا هەیە. ئەگەر خوسـرەو بـن محەمەد کە ٢٠ ساڵێک پێش ماە شەڕەف خانم لەدایکبـووە، لە نووسینەوەی لاپەڕە بە لاپەڕە و وشە بە وشەی دەقی مێژوونووسـانی پێـش خـۆی زۆر بێبـاک بـووە، بەڵام مـاە شەڕەف خـانم بەپێـێ توانـا تێکۆشـاوە لێکـۆڵینەوە لەو زانیاریـانە بکـات. مـاە شەڕەف خــانم زۆر رەخنەئامێز هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو سەرچاوە مێژووییـانە دەکـات و لە پەڕتووکەکەیــدا زۆر بە دڕدۆنگیــی و گۆمــانەوە ئامــاژە بەو زانیارییــانە دەکات. ئەو بۆچونە بەئاشکرا، مـاە شەڕەف خـانم لە مێژوونووسـەکانی پێــش خــۆی جیــا دەکــاتەوە کە نووســـینەکانیان ئاســـتێکی نــزم و ساکارانەیان پێوە دیارە.

مــاە شەڕەف خــانم گەلێــک زانیــاری بەنــرخ سەبارەت بە بــن و بنەچەکەی کەســایەتییە بەناوبانگەکــانی کوردســتان ئاشــکرا دەکـات. ٩بەشـی سـەرەتای پەڕتووکەکەی، زانیاریی زۆرترمـان پـێ نـادات لەوی

پێش‌تـر سـەبارەت بە مێـژووی خـانەدانی بەنـی ئەڕدەڵان نووسـراوە. لەبەشەکانی‌تردا نووسـەر زانیاری سـەرچاوە کۆنەکان پۆختەتر دەکات و هەڵگـری گەلێـک بـابەت و لایەنـی مانـاداری نـوێ و هـاوتەریب و سرنجڕاکێشە. ئەو پەڕتـووکەی مـاه شـەڕەف خـانم تـاکە سـەرچاوەی سـەرەکی و گەلێـک گرینـگ لە نەوعـی خـۆی دایە بـۆ دووبـارە سـاخکردنەوەی رووداوە ئاڵۆزەکـانی سـەردەمی دوواییـن میرەکـانی خانەدانی بەنی ئەڕدەلان. ئەو پەڕتـووکە بەدەسـتی هاوسـەری میـری ئەڕدەڵان، ژنێکـی لێهـاتوو، کـارزان و هەسـت ناسـک نووسـراوە کە راسـتەوخۆ ئاگـادار و بەشـداری زۆربەی رووداوەکـان بـووە و هەناسە ساردیی ئەو سـەردەمەی پێوە دیارە.

لەو رووداوانەدا باسـی بەشـداریی کـارای کۆمەڵگـا و سـەرۆک هۆزەکـان و بەتـایبەت هەورامییەکـان کـراوە. یەکێـک لەوانە، حەسـن سـوڵتانی هەورامییە کە مـاه شـەڕەف خـانم لە کوێسـتانەکانی هەورامـان و لە هەلـومەرجێکی زۆر نەگۆنجـاودا هامووشـۆ و گفتوگـۆی لەگەڵـدا هەبـووە و هەڵسـەنگاندنێکی گەلێـک جیـاوازتر لە بۆچـوونی خوسـرەو بـن محمەد سـەبارەت بە ئاکـار و رەفتـاری هەورامییەکـان ئاشکرا دەکات.

لە ساڵی ١٨٣٤ و لەتەمەنـی ٣٠ سـاڵێدا، خوسـرەو خـانی حـاکم، میری ئەردەڵان و هاوسـەری مـاه شـەڕەف خـانم کۆچیـدووایی دەکـات. میرنشـینی ئەڕدەڵان تووشـی پەرێشـانی و قەیـران دەبـێ کە بە دەستنیشـانکردنی بێگـانەیەکی نـاودار بە سـتمکاریی و زۆرداریـی

لەلایەن شای ئێرانەوە، کۆتایی پێدێت. خوسرەو خانی گۆرجی[١] دەبێتە دەستەڵاتداری ئەردەڵان.

پاشان هەموو بەگزادەکانی ئەڕدەڵان بڕیاریان دا باروبەرگن بەرەو سلێمانی تێکنێن و پەنا بۆ میری بابان بەرن. ماه شەڕەف خانمیش یەکێک لەو هەزاران پەنابەرە بوو کە لەڕێگای کوێستانەکانی هەورامان تۆشی گەلێک کوێرەوەری و دژواری دەبنەوە، بەڵام حەسەن سوڵتانی هەورامی بە باوەشێکی ئاواڵە پێشوازیی لە لێقەوماوانی ئەڕدەلان دەکات و "ئەوپەڕیی دابونەریتی کوردەواری بەجێگەیاند" (ماه شەڕەف خانمی کوردستانی، ١٩٩٠، ل.ل. ١٨١-١٨٢), بەو شێوەیە بەپێچەوانەی بۆچوونی خوسرەو بن محەمەد کە بە "تاقمێکی خۆفرۆش و تاوانکار" ناویان دەبات، هەورامییەکان و سەرۆکەکەیان، لەپێش چاوی ماه شەڕەف خانم پابەندبوونیان بە دابونەریتی کوردەواری دەسەلمێنن. دیارە هەورامییەکان دیسان، بەڵام درەنگتر دەکەونە بەر پلاری میرزا عەلی ئەکبەری کوردستانی.

پێویست بە ئاماژەیە کە چوار ساڵ پاش مەرگی ماه شەڕەف خانم و لە کۆتایی ساڵی ١٨٥١دا، حەسەن سوڵتانی هەورامی دیسان شوڕش دەکات و ئەمانوڵڵاخانی دووەم، میری ئەردەڵان بەبڕیاری شای [قاجار] و بەهاوکاریی هێزە سەربازییەکانی، ڕاپەڕینی هەورامییەکان سەرکۆتدەکات.

---

[١] [Andre Ghaytmazeants ئاندرە قایتمئازیانتس، ناسراو بە خسرەو خانی گورجی (١٧٨٥ تفلیس، ١٨٥٧ تاران)، لە هاوینی ١٨٠٤ لە نزیک قەڵای یەرەڤان لە لایەن سۆپای قاجار بەدیل دەگیرێ. پاشان لە تاران یەختەی دەکەن و دەبێتە "خواجە"یەکی ناودار و دەستڕۆیشتوو لە دەرباری "فەتحعەلی شا" و "ناسرئدینی شا"ی قاجار. ویکیپێدیا.]

ئەوە کـورتەیەک بـوو سـەبارەت بە هەورامییەکـان کە سـەدان سـاڵ ڕۆبەرووی شـەر و پێکدادانی ئەردەڵانەکان و پاشـایانی ئێران بوونەتەوە.

# میرزا عەلی ئەکبەری کوردستانی [١]

میرزا عەلی ئەکبەری کوردستانی بەپێچەوانەی مێژوونووسەکانی پێش‌تر لەخۆی کە بە برا ناوی بردوون، لە دیوەخانی حاکمی قاجار خزمەتی کردووە، چۆنکوو لە ساڵی ١٨٦٨ میرنشینی ئەردەڵان تێکدەچێ و دەبێ بە ویلایەتێکی ئاسایی ئێران کە ئیتر یەکێک لە ئەندامانی خانەدانی شای ئێران بەڕێوەی دەبات. نووسەری "حەدیقەی ناسریە"[٢] کە دەبێتە فەرمانبەر و خزمەتکارێکی دەستەڵات، زمانحاڵی هەلومەرجی سیاسی و هەڵوێستی فەرمی دەستەڵات لەهەمبەر هۆزی ئەردەڵان بووە و جگە لەوەش نەیتوانیوە هەڵوێست دەربڕێ.

هەریەک لە دەوڵەتانی پاشایەتی ئێران و ئیمپراتۆری عۆسمانی کە

---

[١] [ بە فارسی، "علی اکبر وقایع نگار کردستانی" ]

[٢] دەقی ئەو دەستنووسە لەلایەن نووسەری ئەو دێرانە ئامادەکراوە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە کە لە زمانی فارسی بۆ رووسی وەرگێڕدراوە و بریتییە لە: پێشەکی، تێبێنیی و خشتەیەکی سەرچاوەکان لەسەر پێشنیازیی زانایانی ئەنجۆمەنەی پەیمانگا [پەیمانگای دەستنووسە رۆژهەڵاتییەکانی ئاکادێمیای زانستەکانی رووسیا]، بەڵام ئێستا لەچاپ نەدراوە.

[ساڵی ٢٠١٢ لەچاپدراوە. بڕوانە ل. ٨ , جێی ئاماژەیە نووسراوەی بەردەستتان ساڵی ٢٠٠٣ نووسراو.]

لە سەرەتای سەدەی ١٦، خـــاکی کوردســـتانیان لەنێـــو خۆیانـــدا دابەشـــکردبوو، بە بـــێ جیـــاوازیی و بە بـــێ پســـانەوە هەوڵـــی سەرکۆتکردنی هـۆزە بەتوانـا و بەهێزەکـانی کوردیـان داوە. ئەو هـۆزە مەزنانەی کە گۆێڕایەڵ و ملکەچی دامو دەزگاکانی دەستەڵات نەبوون، پەراوێـز دەخـران و وەک سەرچاوەیەکی هەمیشەیی مەترسـیی بـۆ دەستەڵات چاویان لێـدەکرا. لە سـاڵانی ٢٠ی سەدەی ١٩دا، ژمـارەی ئاپۆڕای هۆزی مەزنی جاف بە هەزاران رەشماڵ بەراورد کـراوە. بەپێـی ک.ج. ریـچ (Rich, 1836, Vol. I, p. 112, 281) لە کـاتی پێویسـتدا هۆزی جاف توانای تەیارکردنی دوو هەزار سوار و چوار هەزار چەکداری هەبووە کە وەک باشترین هێزی سەربازی لەناو سۆپای کورددا هەژمار کراون.

لەڕاستیدا، نە میرانی خانەدانی بەنـی ئەڕدەڵان و دیـارە نە والـی و حـاکمی قاجـار و هەروەهـا نە سـوڵتانانی عۆســمانی، کاریگەریـان لەسەر هـۆزی جـاف نەبـووە. هـۆزی جـاف بەکـردەوە سەربەخۆ بـوو. کـۆچبەرانی جـاف بەدرێژایـی سـاڵ لەنێـو رەشــماڵەکانیاندا دەژیـان، هاوینـان لە کوێســتانەکانی حـاجی ئەحمەد لەدەوروبەری پێنجـوێن هەروەها لە مەڵبەندەکانی سەقز و مەریوان سەربە نـاوچەی ئەڕدەڵان و زستانانیش لە دوڵ و بەنـدەنەکانی شـارەزوور، سەر بە ئیمپراتـوریی عۆســمانی لە هـاتووچوودا بـوون. لە کۆتـایی سەدەی ١٨دا، بڕیـاری رێگرتن لە کـۆچی هـۆزی جـاف بـۆ "تێپەڕکردنـی خـاکی" کوردسـتانی ئەڕدەڵان درا، بەڵام سەرەڕای رێوشـوێنە تۆندەکانی حـاکمی ئەڕدەڵان، ئەو رێگرییە سەری نەگرت.

هـــۆزی مەزن و بەهێـــزی جـــاف وەک هەمـــوو کـــۆمەڵە یەکگرتـــووە عەشـــیرەتییە تەواوکـــۆچەر و نێوکۆچەرەکـــان، رێـــڕەوی کـــۆچی وەرزیـــی تایبەت بەخۆیان هەبوو کە بە درێژایی سەدان سال دیـاریی کرابـوون و جێکەوتبـوون. لەسـەر ئەو بنەمـایە، هـۆزی جـاف دەیتـوانی ئاڕاسـتەی جێگۆڕکەی وەرزیی بۆ کۆچی هۆز دیاری بکات و لە هەمـوو وەرزەکـانی سـاڵدا، لەگەل زەوییەکـان و شـوێنەکانی نیشـتەجێ بوونیـان لەو ڕێڕەوەدا، وەک زەوی و سامانی خۆیان هەلسـوکەوتیان دەکـرد. مـافی جێگـــۆڕکێ لەگەڵ مـــافی کەڵکـــوەرگرتن لە مەخەڵ و لەوەڕگە تایبەتەکـــان، جـــا چ بەرێکەوتـــن بـــا و یـــا چ بەزۆر، وەک مـــافێکی لێکجیـــانەکراوە و نەگـــۆڕ و سرووشـــتی، لە کوردسـتاندا داسەپابوون. ژیانی جافەکان بەدرێژایی سەدان ساڵ بەو شێوەیە درێـژەی هەبـووە. سیسـتەمی عەشـیرەتی و کـۆچبەری گرینگـی و بـایخێکی زۆری بـۆ کۆمەڵگا هەبووە. پێویستی و لێکگرێدراویی پێوەندییەکانی نێوان وەرزێـر و کـۆچەر بەتەوایـی پێچەوانەی بۆچـوون و تێگەیشـتنی هێنـدێک لە نووسەرانە. لەپشت ناتەبایی بـاوی نێـوان وەرزێـر و کـۆچەر، هەوڵێکـی هاوبەش بۆ هاوکاری و پێکەوە ژیان دەبینرێ کە بەپرِوای م. ب. رۆڤتـۆن یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی سەراسەری رۆژاوای ئاسـیایە (Rowton, 1973, p. 249).

هۆزەکـــان هەر لەسەرەتای دەســـتپێکردنی کۆچەکانیانـــدا و بـــۆ راگوســـتنی کەلوپەلەکانیـــان و دابینکردنـــی ســـووتەمەنی، لەگەڵ وەرزێـران رێکـدەکەوتن. ئەو دوو لایەنە هەروەهـا قـازانجی هاوبەشـیان هەبـــوو لە ئاڵۆگـــۆرکردنی بەرهەمەکانیـــان. ویلیـــام دورویـــل لە

سەفەرنامەکەی خۆیــدا، هەلــۆمەرجی کوردســـتان لە سەرەتاکانی سەدەی ١٩ بەباشی ڕووندەکاتەوە: "دانیشتوانی گۆندەکان بە هاتن و مانەوەی کۆچەرەکان لە زەویی گۆندەکان زۆر دڵخۆشبوون، چۆنکوو مەڕومــاڵاتی پێویســـتیان زۆر بە هەرزانـــتر لە بـــازار، لەوان دەکـــرێ" ( دورویل، ١٨٢٦، بەشی ٢، ل. ١٧٨).

بـــۆیە هەڵسەنگاندنەکەی میـــرزا عەلـــی ئەکبەری کوردســـتانی سەبارەت بە جافەکان نە لەجێی خۆیدایە و نە بنەمای هەیە، کاتێک بە هۆزێکی شەڕفرۆش ناویان دەبا و دەڵێ "ڕەعیەتی بێچارەی کوردستان لەدەستی هەڵسۆکەوتی ناشارستانیانەی ئەواندا بەردەوام ســووک و سەرگەردان بوون" (میرزا عەلی ئەکبەری کوردستانی، پێشــنیازەکانی زانایـــانی ئەنجـــۆمەنەی پەیمانگـــای دەستنووسە ڕۆژهەڵاتییەکـــانی ئاکادێمیای زانستیی ڕووسیا، ل. ٢٠٤).

ئەو بۆچـــونە زور نێگـــاتیڤە لەهەمبەر یەکێـــک لە بەهێزتریـــن و بەناوبانگترین کۆمەڵەی یەکگرتووی عەشیرەتی باشووری ڕۆژهەڵاتـی کوردســـتان، زۆر بـێ جێیە، ئەگەرچـی بەهەڵکەوت نییە و بەتەواویـی هـــۆیەکی ڕوون و ئاشـــکرایە. پەڕتـــووکەکەی میـــرزا عەلـــی ئەکبەری کوردستانی بۆ پێهەڵگوتن بە بەژن و باڵای دەستەڵاتی ئێران نووسراوە و ڕەزامەندیی ئەو دەستەڵاتەی مەبەستە.

تـــا ئەو کـــاتەی میرانـــی خـــانەدانی ئەڕدەڵان لەدەســـتەڵاتدا بـــوون، سەرەڕای ملکەچ نەبـــــوونی جافەکـــــان و ئاڵـــــۆزی لەنێوانیانـــــدا، هەلـــومەرجەکە لە چوارچێـــوەیەکی گۆنجـــاودا تێـــدەپەڕی. شەڕ لە

نێوانیانـدا سـاز دەبـوو، ئاشـت دەبـوونەوە، خـانەدانی میـران پێوەنـدیی خزمایەتییان لەگەڵیاندا سـاز دەکـرد و هەمدیسـان بەشـەر دەهـاتنەوە. بە فەرمانی شا لەشکرکێشی بۆسـەر جافەکان کراوە، ئەوانیش خافـڵ نەبوون و جارجار ناوچەکانی دەوروبەری خۆیانیان خستووتە دڵڕاوکـێ و ترسـەوە (خوسرەو بن محمەد بەنـی ئەڕدەڵان، ١٩٨٤، ل. ١٧٣), بەڵام هەمیشە رێگاچـارە دۆزراوەتەوە و هـۆزیش درێـژەی بە ژیـانی ئاسـایی خۆی داوە و گەرمێن و کوێستانی هۆزیش هەر بەردەوام بووە.

پـاش سـاڵی ١٨٦٧ کاتێـک کۆتـایی بە حکـومەتی میرنشـینی ئەڕدەڵان هێنـرا، دەسـتەڵاتی ئێـران و هۆزەکـانی کـورد کەوتنە رووبەروویی تـاک بە تـاکی یەکـتر. دەسـتەڵاتی ئێـران بـۆ پێشـگرتن لە گەرمێن و کوێسـتانی جافەکان لەو شوێنانەی بەزانـدنی سـنوورەکانی ئێران و عۆسـمانی دەگرتەوە، هێزی سـەربازی رەوانە ئەو ناوچـانە کـرد. رێوشـوێنە باوەکانی ژیانی هۆز تێکچوو. مەڕومالاتی هۆز لەنـاو چـوون و زیـانێکی دارایـی مەزن لەهـۆز کەوت. سیسـتەمێکی ئابـووری کە بە درێژایی سـەدان سـاڵ پێکهاتبوو، لەناوچوو.

نووسـەری "حەدیقەی ناسریە" ئەنجامدانی فەرمانی شا سـەبارەت بە "نابودکردنی هۆزی جاف"، بە یەکەم ئەرکی شـازادە فەرهـاد میـرزا، حاکمی ئەڕدەڵان ناودەبا. دیارە فەرهاد میرزا نەیتـوانی جافەکـان نـابود بکات[١]، بەڵام راسـت ئەرکی سـەرشـانی شـازادە نـابود کردنیـان بـوو کە

---

[١] لەدەقەکەدا هاتووە: "ئەعلاحەزرەتی شازادە بەپێی فەرمانی شای تاجدار هەوڵی دا کاریـان یەکسـەرە بکاتەوە تا لە لاپەڕەکـانی [مێـژووی] کوردسـتاندا نـاو و نیشـانیان نەمێنێـت". ڕوانە، میـرزا عەلـی ئەکبەری کوردسـتانی، تێبینییەکـانی ئەنجـۆمەنی زانایـانی پەیمـانگەی دەستنووسە رۆژهەڵاتییەکان سـەر بە ئاکادێمیای زانسـتیی رووسـیا. ل.٢٠٣.

دەکـرێ بیخەینە ریـزی تـاوانە مەزنەکـانی ماڵبـاتی پاشــا. "تـاوان"ی هەڵبەستراو بۆ جافەکان، تەنیـا بریـتی لە دوو جـار لە ســاڵێکدا سـنوور بەزانـدنی هۆزەکەیـان بـوو کە کـورد لە هەر دوو لادا نیشـەجێ بـوون و جافەکـــانیش تەنیـــا لەچوارچێـــوەی خـــاکی مێژوویـــی کوردســـتاندا هاتوچوویان تێدا دەکرد.

سـەبارەت بەو هەڵسـەنگاندنانەی نووسـەر سـەبارەت بە هۆزەکـانی هەورامـــی و جـــاف کە پێشـــتر ئاماژەمـــان پێکـــرد، پێویســـت بە روونکـــرنەوەیەک هەیە. میـــرزا عەلـــی ئەکبەری کوردســـتانی خزمەتکـــارێکی حـــاکمی قاجـــار بـــووە و نەیـــدەتوانی لە دەرەوەی هەڵوێسـتە سیاسییە فەرمییە و بۆچوونەکانی ماڵباتی شـادا بۆچوون و هەڵسـەنگاندنی هەبێـت. مخـابن، لەکـاتی چـاوپێکەوتن بەو لێـدووان و گۆشـە نیگایـانەدا نـاکرێ هەلومەجەکـان نەدیـدە بگریـن چۆنکـوو لای نووسـەری ئەو دیرانە هەلـــــومەرج گەلێـــــک گرنگـــــی هەیە لە هەڵسـەنگاندن و دەرخسـتنی راسـتییەکانی بۆچوونی مێژوونووسـدا.

میـرزا عەلـی ئەکبەری کوردسـتانی زۆر رێـزی هەبـووە بـۆ داب و نەریـتی (یاســای) عەشـیرەتی و وەک "بنەمـا کۆنەکـانی کە کـورد نـــاتوانی خۆیـــان لـــێ بێبەری بکـــات" چـــاوی لێکـــردووە. بەدرێژایـــی نووسـینەکانیدا، میرانی ئەڕدەڵان کە "یاسای هـۆز"یـان لەژێرپـێ نـاوە، بەدزێویی ناوی لێ بـردوون و بە شـان و بـاڵی ئەوانەشـی هەڵگوتـووە کە پەیڕەوییـــان لەو یاســـایانە کـــردووە. شەهاب ئەلموڵـــک، والـــی کوردسـتان، یەکێک لەو کەسانە بـووە کە بەپێـی داب و نەریـتی هـۆز و عەشیرەت هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکی کوردسـتاندا کـردووە و بـۆتە

مایەی پێهەڵگوتنی میرزا عەلی ئەکبەری کوردستان.

میرزا عەلی ئەکبەری کوردستانی لە پەڕتووکەکەیدا تەنیا خەریکی پێهەڵگوتن و بەدزێو ناوبردنی حاکمە جیاوازەکان نەبووە، بەڵکو بۆخۆی لە ساڵی ١٨٨٤دا، بەپێی "یاسای هۆز" کێشەی نێوان دوو هۆزی تیلەکۆ و "گەلبەگی"ی چارەسەر کردووە. نووسەر لەو کاتەدا لە کوردستانی موکریان و لە خزمەت سەیفەدینی موکری "مۆنشی باشی" بووە. جێنشینی پاشای ئێران بە برۆسکە فەرمانی گەڕانەوەی بۆ ئەردەڵان پێدەدات و میرزا عەلی ئەکبەریش بەوردی کێشەکانی نێوان ئەو دوو هۆزە بەپێی دابونەریتی عەشیرەتی چارەسەر دەکات.

دەکرێ بە بێ بەڵگە بڵێین کە لای میرزا عەلی ئەکبەری کوردستانی، هۆزەکانی کورد بەخۆدی خۆی جێگای گازەندە نەبوون، هەڵوێستەکەشی سەبارەت بە جاف و هەورامییەکان ئاساییە و بەهۆی فەرمیی بوونی پلەوپایەی لەکاتی نووسینی پەڕتووکەکەیدا یە.

# سەرچاوەکان

1-Архив РАН, ф. 2, оп. 1–(1865), № 20

2- Бамдад М. Тарих-и риджал-и Иран корун-и 12–13–14, та′лиф-и Махди Бамдад. Тихран, 1966.

3-Васильева Е.И. Термины „таифе‟, „аширaт‟, „кабиле‟ в сочинении Шараф-хана Бидлиси
"Шараф-наме" // ППиПИКНВ. V. Л., 1969.

4-Васильева Е.И. Юго-Восточный Курдистан в XVIII — начале XIX в. Очерки истории эмиратов
Арделан и Бабан. М., 1991.

5-Васильева Е.И. Версии "инородного" происхождения знатных курдских фамилий как социаль-
ный феномен // ППиПИКНВ. XXIV. Ч. 1. М., 1991.

6-Васильева Е.И. Книга по истории Курдистана, которая остается ненайденной // ППиПИКНВ.
XXIV. Ч. III. М., 1991.
7-Васильева Е.И. Шараф-хан Бидлиси. Эпоха. Жизнь. Бессмертие. СПб., 2005.
8-Друвиль Г. Путешествие в Персию в 1812 и 1813 гг. / Пер. с франц. Ч. II. М., 1826.
9-Мах Шараф-ханум Курдистани. Хроника дома Ардалан (Та'рих-и Ардалан) / Пер. с. перс.,
введ. и примеч. Е.И. Васильевой. М., 1990.
10-Мела Махмуд Байазиди. Таварих-и кадим-и Курдистан (Древняя история Курдистана) Т. I /
Перевод "Шараф-наме" Шараф-хана Бидлиси с персидского языка на курдский (курманд-
жи). Изд. текста, предисл., указ. и оглавление К.К. Курдоева и Ж.С. Мусаэлян. М., 1986.
11-Мирза Али-Акбар Курдистани. Хадике-йи Насирийе. MS Института восточных рукописей РАН.
12-Мусаэлян Ж.С. А.Д. Жаба и курдоведение // ППиПИКНВ. XXIV. Ч. III. М., 1991.
13-Мухаммад Шариф Кази. Зубдат ат-таварих-и Санандаджи. MS библиотеки Кембриджского
университета.
14-Папазян А.Д. Новые источники по истории курдского

народа // Страны и народы Ближнего
и Среднего Востока. Т. VI. Курдоведение. Ереван, 1975.
15-Петрушевский И.П. Очерки по истории феодальных отношений в Азербайджане и Армении
в XV — начале XIX в. Л., 1949.
16-Петрушевский И.П. Ислам в Иране в XII–XV веках. Л., 1966.
Рашад Сабри Рашид (Рашад Миран). Этноконфессиональная ситуация в современном Курди-
стане. М.–СПб., 2003.
17-Тарих-и Ардалан. Та'лиф-и Хусрав ибн Мухаммад ибн Манчихр Ардалан машхур ба Мусан-
ниф. Тихран, мах-и сафар 3536.
18-Тарих-и Мардух. Та'лиф-и Мухаммад Мардух Курдистани. Джилд-и I–II. [Б.м.], 1944.
19-Хусрав ибн Мухаммад Бани Ардалан. Хроника (История княжеского дома Бани Ардалан). Фак-
симиле рук., пер. с перс., введ. и примеч. Е.И. Васильевой. М., 1984.
20-Шараф-хан ибн Шамсаддин Бидлиси. Шараф-наме / Пер., предисл., примеч. и прил. Е.И. Ва-
сильевой. Т. I. М., 1967.
21-Шараф-хан ибн Шамсаддин Бидлиси. Шараф-наме / Пер. с перс. предисл., примеч. и прил.
Е.И. Васильевой. Т. II. М., 1976.

22-Bruinessen M. van. Agha, Shaikh and State. On the Social and Political Organization of Kurdistan.
Utrecht, 1978 (repr. New Jersey, 1992).
23-[Browne E.G.] A Descriptive Catalogue of the Oriental MSS, Belonging to the Late E.G. Browne by
E.G. Browne / Complited and Edited by R.A. Nicholson. Cambridge, 1932.
24-Mardukh Abdollah. Contribution a l'etude de l'Histoire des Kurdes sous la dynastie Ardalān du XVIe
siecle au XIXe siecle. These de doctorat. P., 1988.
25-Minorsky V. Kurds, Kurdistan. III. History // EI2. Vol. V. 1981, fasc. 85–86. P. 447–464.
26-Nikitine B. Les Kurdes. Etude sociologique et historique. P., 1956.
27-[Rich Cl.J.] Narrative of a Residence in Koordistan and on the Site of Ancient Nineveh… by… Cl.J. Rich. Vol. 1–2. L., 1836.
28-Rowton M.B. Autonomy and Nomadism in Western Asia // Orientalia. 1973. Vol. 42. Fasc. 1–2.